


دۆسیەی ئەزموونی ڕۆماننووسیی

# بەختیار عەلی



# من شەهرەزادی حیکایەتم،
# شەهریار!



بوشرا کەسنەزانی

ڕەخنەی فێمێنستی یەکێکە لەو لقانەی ڕەخنەی ئەدەبی، کە لە شیکاری دەقەکاندا پشت بە باسەکانی دەرەوەی دەق دەبەستێت و خۆی لە ناو چوارچێوەی دەقدا قەتیس ناکات. ئەم ڕەخنەیە بە دیدێکی ترەوە و لە پێناوی نیشاندانی جیاوازیکردن لە نێوان ڕەگەزەکاندا کار لە ناو دەقی ئەدەبیدا دەکات. پەیڕەوانی ئەم جۆرە رەخنەیە لایان وایە، دەقە ئەدەبییەکانیش، بە تایبەت ئەوانەی لە لایەن پیاوانەوە



نووسراون، وەک هەر بابەتێکی تری ئەم جیهانە لە دروستکردنی جیاکاریی رەگەزی و پێشێلکردنی مافی ژندا پشکیان هەیە. ئەم شێوازە لە رەخنەی ئەدەبی جگە لەوەی لە ناو دەقی پیاواندا بە دوای وێنەی دروستکراوی ژندا دەگەڕێت، لەتەکیشیدا کار لە ناو ئەو دەقانەدا دەکات، کە نووسەرەکانیان ژنن و بەهۆی شیکاریی دەقەکانەوە گەرەکێتی پێگەی ژن لە ناو ئەدەبدا تۆختر بکاتەوە. لە لایەکی ترەوە ئەم جۆرە رەخنەیە بە دوای دەرخستنی شێوە و شکڵی ئەو ئەدەبەدایە، کە بە دیدی تر و لە ناواخنێکی ترەوە دێتە بوون و هەڵگری ئەدگاری جیهانی مێینەیە!

یەکێک لە پێشەنگەکانی رەخنەی فێمینیستی ڤێرجینیا وۆڵف بوو، بە تایبەت ئەو دەمەی لە باسێکیدا بە ناوی (ژن و ئەدەبی چیرۆک) ئاماژە بەو هۆکارگەلە دەکات، کە بۆچی ئەدەبی ژن پشتگوێ خراوە. لەم باسەدا وۆڵف دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی نووسینی ژنان و ئاماژە بە چەند ژنەنووسەرێکی دیار دەدات، کە لە بواری چیرۆک و رۆماندا قەڵەم بە برشت بوون، کەچی لە ناو بازنە ئەدەبی و ئەکادیمییەکاندا بە هەند وەرنەگیراون.

رەخنەی فێمێنیستی لە ناو ئەدەبیاتدا بە دوای رەگی قووڵ و دێرینی پیاوسالاریدا دەگەڕێت. بە درێژایی مێژوو زۆربەی نووسەران پیاو بوون، هەر بۆیە پاڵەوان و شاکەس و کارەکتەری تیشکلەسەر پیاو بوون و رۆڵێکی پەراوێزیش بە ژن دراوە. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بە نموونە جیهانییەکانی وەک ئۆدیب، ئۆدیسیوس، هاملێت، تۆم جۆنز، هۆک فین و چەندانی تر بکەین. ئامانجی رەخنەی فێمێنیستی ئەوەیە کە مادەم ژن رەگەزێکی دیار و نیوەی کۆمەڵە، بۆیە دەبێت لە ئەدەبیاتیشدا پڕڕەنگ بکرێتەوە و مافی خۆی وەک کارەکتەری دیار و وەک پاڵەوان پێبدرێت.

ئەوەی گرنگە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئەوەیە کە ئێمە بتوانین لە رێگەی ئەم رەخنەیەوە کار لە سەر چەند دەقێک بکەین. بۆ ئەم کورتەباسە ئێمە دەقی نووسەرانی پیاومان هەڵبژاردووە، ئەو دەمەی پاڵەوان و وەگێڕیان (حیکایەتخوان) ژنە و لە ناو دەقەوە کار لە سەر ئەو کۆد و ئاماژانە دەکەین، کە نیشاندەری وێنەی کارەکتەرەکانن و پێگە و ئەرکی هەر یەکەیان وەک کارەکتەری ناو چیرۆک و وەک بوونەوەری کۆمەڵگە دیاری دەکەین!

## کێ خەریکە قسە دەکات؟

بەر لە هەر شتێک ئەو دەمەی رۆمانێک دەخوێنینەوە، کە دەست دەکەین بە یەکەم دێڕ ئەم پرسیارە لە مێشکماندا دەنگ دەداتەوە: کێ ئەم حیکایەتەمان بۆ دەگێڕێتەوە؟ وەگێڕی حیکایەت لە یەکەم بەرهەمی دێرینی جیهانیدا بێگومان شەهرەزادە، شەهرەزاد دەسەڵاتی تەواوی بە سەر تێکستدا هەیە، بە زاری خۆی رووداوەکان باس دەکات، حیکایەتەکان دەگێڕێتەوە و تاسە و مەیل و چاوەڕوانی لە ناخی گوێگردا دەچەسپێنێت. لە تێکستی نوێشدا کاتێک رووبەڕووی رووداو دەبینەوە، هەمان پرسیار لە نائاگاییەوە دێتەوە زەینمان، کێ ئەمانەمان بۆ باس دەکات؟ ئەودەم مەرج نییە شەهرەزاد بێت، دەشێت شەهریار بێت و بیەوێت لەوێوە درێژە بدات بە کوشتنی ژنان، خۆ دەشێت رزگارکەریش بێت. ئەم بڕیارەش دەکەوێتە سەر دەقەکە و شرۆڤە و شیتەڵکردنی گشت لایەنەکانی!



له ئەدەبی چیرۆکناسیدا کەسی وەگێڕ بەهای تایبەتی خۆی هەیە و نووسەر بەوپەڕی وردیی سەرنجەوە حیکایەتخوان هەڵدەبژێرێت و لە نیگای ئەوەوە ڕووداوەکانمان نیشان دەدات. وەگێڕ بە چەندان شێوە دەردەکەوێت، دەشێت خۆی لە ناو چیرۆکەکەدا بێت و هەڵسوڕاوی ڕووداوەکان بێت یانیش لە دەرەوەی چیرۆک بێت. وەگێڕی ناو چیرۆکیش بۆ خۆی دابەش دەبێت بەسەر دوو جۆردا: دەشێت وەگێڕ خۆی پاڵەوان بێت و باسی خۆی بکات، یانیش کەسی دووەم و سێیەم بێت و ژیانی کەسێکی دیکە بگێڕێتەوە، (بۆ نموونە کۆشکی باڵندە غەمگینەکان). وەگێڕی دەرەوەی چیرۆک دەتوانێت وەک حیکایەتخوانی هەمووشتزان (پێزانی گشتی) دەرکەوێت، کە چەشنی خودای چیرۆک لەو سەرەوە ئاگاداری هەموو ڕەوت و ڕووداو و جووڵە و سرتەیەکە و بۆی هەیە بخزێتە ناخی کارەکتەرەکانیشەوە. بەهای وەگێڕ لەناو ئەدەبیاتی چیرۆکیدا، بە تایبەت وەک گۆشەنیگای گێڕانەوە، لەوەدایە کە نووسەر هەوڵ دەدات باشترین و گونجاوترین کارەکتەر بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکات و دیدی ئەو، ئەو گۆشەنیگا گرنگە بێت، کە شایستەی ئەوەیە خوێنەر شتەکانی لێوە ببینێت. ئەم گۆشەنیگایە مەرج نییە هەمیشە نووسەر بێت، بەڵکو دەشێت کەسی ناو چیرۆکەکە بێت. فرەجار نووسەران بە مەبەستی ئێستاتیکای گێڕانەوە و ناباوکردن لە گێڕانەوەدا، کەڵک لە گۆشەنیگای کەسانی منداڵ یان نەخۆش یان زەین گەشەنەکردوو وەردەگرن، نموونەی دیاری ئەمە لە (تورەیی و هەراوهۆریا)ی ویلیام فۆکنەردایە، کە یەکەم وەگێڕ پیاوێکی سی ساڵەی زەین ناکامڵە، یان سالینجەر لە ڕۆمانی (پاسەوانی دەشت)دا کە گۆشەنیگای گێڕانەوە لە چاوی مێردمنداڵێکی دەروون نەخۆشەوەیە. زۆر ڕۆمانیش هەن لە چاوی کەسانی ئاساییەوەن، بەڵام ئەم ئاساییە دەبێت بە نائاسایی و لە باوەوە بۆ چوارچێوەی ناباو دەترازێت، ئەو دەمەی نووسەرەکە پیاو بێت و گۆشەنیگاکەش ژن. دیارە خودی ئەم کارە لادانە لە یاسای باوی ڕۆماننووسین و چیرۆکنووسین و سەرلەنوێ ڕوانینەوەیە بە دیدێکی ترەوە لە پرۆسەی گێڕانەوەی حیکایەت وەک هونەرێکی تایبەت بە سەردەمی نوێ (بە تایبەت ڕۆمانی نوێ). لێرەدا دەشێت پرسیارێک بێتە ئاراوە: جیاوازیی وەگێڕ لە چیدایە ئەگەر هەر ڕەگەزێک بێت؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەتوانین لە ڕۆمانی (ئێوارەی پەروانە)ی بەختیار عەلی بڕوانین. خودی نووسەر لە دەرەوەی دەقدا پیاوە. بەو پێیەش کە کەسی وەگێڕ ناوەکییە و بەشداری ڕووداوەکانە، خوێنەر وا چاوەڕوان دەکات دەنگێکی پیاوانە حیکایەتی بۆ بکات، بەڵام بە پێچەوانەی ئەم وێنایەوە، دەنگێکی دی قسەکەرە، کە کچە. بۆ ناسینەوەی ئەم دەنگەش ڕۆمانەکە بە ناساندنی کارەکتەرەکە دەست پێدەکات و دەڵێت: (من خەندانی چکۆلە چەندین ساڵ هەموو ئەو ڕووداوە سەیرانە ژیام کە دوواجار ئەستەم بوو تا کەمێک گەورە نەبم نەتوانم لە هەموو ماناکانیان تێبگەم و بیاننووسمەوە..) لەبەر ئەوەی ناتوانرێت خودی دەنگەکە وەک ئاوازە بناسرێتەوە، وەگێڕ خۆی دەناسێنێت، بە ناویشیدا دەزانین کە خانمە و خودی نووسەر نییە!

ئەم دەنگە ژنانەیە، کە دواتر لە هەندێک جێی ڕۆمانەکەدا وەک ئاوازە و ترپە و شێوەی دەربڕینی

لە ئەدەبی چیرۆکناسیدا کەسی وەگێڕ بەهای تایبەتی خۆی هەیە و نووسەر بەوپەڕی وردیی سەرنجەوە حیکایەتخوان هەڵدەبژێرێت و لە نیگای ئەوەوە ڕووداوەکانمان نیشان دەدات. وەگێڕ بە چەندان شێوە دەردەکەوێت، دەشێت خۆی لە ناو چیرۆکەکەدا بێت و هەڵسوڕاوی ڕووداوەکان بێت یانیش لە دەرەوەی چیرۆک بێت.



ژنانە دەناسرێتەوە، خودی خۆی بەشداری ناو ڕەوتی ڕووداوەکانە. هونەرکاری لەوەدایە، کە نە تەنها خودی خۆی پاڵەوانە و باسی خۆی دەکات، نە تەنها وەگێڕی بەسەرهاتی پاڵەوانیشە، بەڵکو ئاوێتەسازی هەردوو تەکنیکەکەیە و توانەوەی دوو وەگێڕە لەیەک وەگێڕدا: لە لایەکەوە خەندان بە باسی خۆی دەست پێدەکات و بەسەرهاتەکانی خۆی باس دەکات، لە لایەکی ترەوە بەهای تەواوەتی دەدات بە چیرۆکی ژیانی پەروانە، کە وەک پاڵەوان دەردەکەوێت. بەم شێوەیەش ئاوێتەسازیی دوو شێوەکە بەرجەستە دەبێت، کە هەمیشە ڕەوتی گێڕانەوە لە نوێبوونەوە و لە ناو یاریکردنی بەردەوامدایە، بەبێ ئەوەی خوێنەر بە ژیانی تاقە کەسێکەوە جاڕس بکات!

وەک لایەنی هونەری، کەسی وەگێڕ خەندانە، بەڵام بە بەردەوامی دەیەوێت بڵێت: ئەوەی من دەیگێڕمەوە ژیانی خۆم نییە، بەڵکو بەسەرهاتی پەروانەیە، کە وەک پاڵەوان لە ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێت. لێرەدا مادەم دەم لە باسی پاڵەوان دەدرێت، بەوپێیەش کە ڕووداوەکان بەسەر ژنگەلێک و دواتر بەسەر پیاواندا هاتوون، ئەوا دەبێت هەڵوێستە لەسەر ناوی پاڵەوان یان قارەمان بکەین. بەدرێژایی مێژووی ئەدەبیاتی گێڕانەوە، ئەو دەمەی باس لە پاڵەوان کراوە، مەبەست لێی کەسی تایبەت و ئازا و لێهاتوو و بزوێنەری ناو ڕووداوەکان بووە، کە دواجار وەک ڕزگارکەر و فریادڕەس سەیر کراوە. دیارە ئەم پاڵەوانەش بە دڵنیاییەوە، کارەکتەری پیاوە نەک ژن، بەڵام لە ڕۆمانی نوێدا ناوی پاڵەوان گۆڕاوە بۆ کارەکتەری سەرەکی یان شاکەس، لە فۆڕمێکی تریشدا هەر بە پاڵەوان ماوەتەوە، وەلێ لەبەرئەوەی تایبەتمەندیی پاڵەوانی کلاسیکی تێدا نییە، بە دژەپاڵەوان ناسراوە!

ئەگەر بمانەوێت لەم ڕۆمانەدا پاڵەوان دیاری بکەین، ئەوا لە نێوان خەندان و پەروانەدا ون دەبین. هەروەها دەبێت دڵنیا بینەوە لەوەی ئاخۆ وشەی (پاڵەوان) لێرەدا گونجاوە یان نا، بەو مانایەی ئایا دەشێت دواجار بەکەسیان بوترێت پاڵەوان یان تەنها وەک کەسی سەرەکی و شاکەس لێیان بڕوانرێت؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ڕووناکیی سەر تەختی شانۆکە لەسەر ئەوانە و تا بەرەو کۆتاییش دەچێت، ئەوانی تر لە تاریکیدا ون دەبن و شانۆکە بۆ خەندان، کە وەگێڕ و شایەتحاڵی تەواوی ڕووداوەکانە، چۆڵ دەبێت، تا ئەو ئاستەی هەست بە چۆڵییەکی سامناک دەکرێت، کە دواجار لە ماڵێکی تاریک و چۆڵ و تەنهادا دادەنیشێت و بەسەرهاتەکانی ساڵانێک لەوەوبەر بۆ ئێمە باس دەکات.

بۆ دیاریکردنی پاڵەوانێتیی ئەم کارەکتەرە حیکایەتخوانە، پێویستە ئاماژە بە ڕای (زیگرید واگڵ) بدەین. لە باسێکی فرە وردیدا واگڵ جەخت لەوە دەکاتەوە، کە خودی زاراوەی پاڵەوان تایبەتە بە ڕەگەزی نێرو هەڵگری خەسڵەتە نێرایەتییەکانە، ئەمەش جێگەی گومان و مشتومڕ نییە، چونکە کەسی پاڵەوان دەبێت ئازا و فریاڕەس بێت. بەپێی دەقە دێرینەکانیش ئەوە لە کێشی ڕەگەزی مێدا نییە. لەبەرامبەر ئەم خەسڵەتە نێرینانەشدا هەندێک هاوواتای دیکە هەن، کە هەرچەند ناتوانن ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوە، بەڵام لە ئەدەبیاتی گێڕانەوەدا بەکار دەبرێن، ئەویش خەسڵەتی (نەجابەتە) کە لە زمانی کوردیشدا هەمان وشەی بۆ بەکار دێت،

تا ئەو ئاستەی لە تێکستە فۆلکلۆرییەکانیشدا هەیە، (یاری من نەجیبە)، جگە لە زاراوەگەلی (بەئابڕوو، بەحەیا، بەشەرم، هتد) کە هەموو ئەم سیفاتانە بەرامبەر بە ئازایی و دلێری و چاونەترسی و لێهاتوویی و مەردایەتی دێنەوە، بە تایبەت لە زمانی کوردیدا. واگڵ تیشک دەخاتە سەر ئەوەی وشەی پاڵەوان، واتای مەردایەتیشی تێدایە، تا ئەو ئاستەی دەڵێت: مەرد بە، یان نامەرد. لێرەدا پێشگری (نا) باشییەکان خاڵی دەکاتەوە و وشەکە وەردەگێڕێتەوە سەر دژە کردەکانی.

لە نووسینێکیدا بە ناوی (پاڵەوانی بەقوربانیبوو و قوربانی پاڵەوان) زیگرید واگڵ دەڵێت بە پێچەوانەی زاراوەی پاڵەوانەوە، کە تەواو هەڵگری خەسڵەتی پیاوانەیە، قوربانی هەڵگری خەسڵەتی ژنانە و بۆ ئەوان بەکار دێت، بە تایبەت لە فەرهەنگی پیاوسالاریدا. وشەکانی قوربانی و پاڵەوان وەک زۆر جووتە وشەی دیکە وەهان، کە بۆ ژن و پیاو بەکار دێن، (بکەر و بەرکار، بەهێز و لاواز، جەستە و هۆش، هەست و ڕێکخەری، بێشیرازەیی و دیاریکراوی) کە هەریەک لەمانە نیشاندەری ناتەبایی نێوان ژن و پیاوە.

بوونە قوربانی دەشێت بە شێوەگەلی جودا بێت، بۆ نموونە لە ڕووی دەروونی و هزری و سۆزدارییەوە بێت، یاخود لە ڕووی جەستەیی و کۆتاییهێنانی تەواوەوە بێت بە ژیانی کەسێک، ئەو دەمەی لە ناو ڕۆماندا دووچاری کێشە و نەهامەتییە جۆراوجۆرەکان دەبێت و لە ناو کێشە کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ کێشەی تر دەچێت.

ئەم دوو چەمکە، واتە پاڵەوان و قوربانی، لە ڕۆمان و دەقی گێڕانەوەییدا تەواو بەرامبەر یەک نین، چونکە دەشێت هەندێکجار کەسی قوربانی ببێتە کەسێکی پاڵەوان و بەهۆی ڕووداوەکانەوە پێگەیەکی تری پێبدرێت. هەر ئەمەشە زۆرجار وادەکات کەسی نەهامەتدیدە، لە ئەدەبدا بە جوانی و بە ئازایی تەماشا بکرێت.

لە ئێوارەی پەروانەدا دوو قوربانی هەن، کە دواجار هەردووکیان پاڵەوانی دەمێکی ناو بەسەرهاتەکانن. لە سەردەمی یەکەمدا پەروانە، ئەو کیژە سەربەهەوا و جیاوازەیە، ڕۆحێکی سەرکەشی هەیە و ڕازی نابێت بەو شێوە ژیانەی کە تێیدایە و لە خەونی ڕزگاریدایە لەگەڵ پیاوی خەونەکانیدا. هەمیشەش قوربانی دەستی خۆشەویستەکانێتی لە ڕووی سۆزدارییەوە و تەنانەت لە ڕووی سەرجێییکردنی هەندێکیشیانەوە کە دواجار جێی دەهێڵن. ئەمەش بەردەوام دەبێت تا دەمی عاشقبوونی و ڕۆیشتنی بۆ جەنگەڵی عاشقان! ئەم کارەکتەرە وەک کچ، قوربانی دەستی کۆمەڵگە و دەستی عاشقەکانی و یار و دواجار دەستی کولتووری پیاوسالارییە، کە قوربانیبوون لە ڕووی سۆزداری و دەروونییەوە دەبێتە قوربانی جەستەیی و لە کۆتاییدا لەناوی دەبەن. بە درێژایی گێڕانەوەی ڕووداوەکان (کە لە یادمان بێت لە زاری خەندانەوەیە، خەندانیش خوشک و خۆشەویستی ئەوە، ئەو کەسەیە کە لەبری ئەو دەبێتە قوربانی دووەم)، ئەوەی کە خەندان خوشک و نزیکی پەروانە و وەگێڕە، وا دەکات ئێمە بەچاوی هاوخەمییەوە بۆ پەروانە بڕوانین. ئەمە ئەسڵی بابەتەکەیە. نووسەر دەبێت وریا بێت لە نیشانکردنی وەگێڕی خۆیدا، چونکە ئەگەر وەگێڕ پیاو بوایە، بۆ نموونە باوکی پەروانە بوایە، ئایا ئێمە هەمان هاوسۆزی و خەممان بۆی دەبوو؟


موکری



یاخود ئەگەر ژن بوایە و زەینەبی کوێستانی بوایە، بە چ شێوەیەک وێنەی پەروانەی بۆ دەکردین؟ بۆیە ئەم هەڵبژاردنە بە بەهایە، گرنگە کە ئێمە لە دیدی خەندانەوە پەروانە دەبینین، ئەو چۆن بیبینێت ئێمەش هەر بەو چاوە تەماشای دەکەین و دەبینە هاوکاری بۆ ئەوەی حیکایەتەکەی لە ناو نەچێت!

لە قۆناغی دووهەمدا خەندان خۆی دەبێتە قوربانی، بەڵام بە ڕەچاوکردنی هاوتەریبیی ڕووداوەکان، لە دەمی قوربانیبوونی پەروانەوە ئەمیش دەبێتە قوربانی. ئەمەش لەبەرئەوەی کە خەندان دەبێت لە ڕووی فەرهەنگ و کولتووری کۆمەڵگەوە باجی ئەو هەڵەیە بدات، کە پەروانە کردوویەتی. خەندانی بچکۆلە لەم قۆناغەدا هەموو ئازادییەکی لێ زەوت دەکرێت و دەست بەسەر هەموو ژیانیدا دەگیرێت، تاکو مێژووی خوشکەکەی دووبارە نەکاتەوە!

دەمی گۆڕانی خەندانیش لە قوربانییەوە بۆ پاڵەوان هەر لەم قۆناغەدایە، هەڵبەت لە یادمان بێت پاڵەوان بە مانا نێرانەکەی نا، بەڵکو بە مانای کارەکتەرێکی سەرەکی، کە دەبێتە جێگەی سەرنجی خوێنەر و خوێنەر بە بڕوای تەواوە گوێ بۆ قسەکانی دەگرێت. بەشی زۆری ڕووداوەکان لە دەمی خەندانەوە دەگێڕدرێتەوە، کە خۆی شایەتحاڵە، ئەو دەمانەشی کە ڕووداو لە چاوی ئەو شاردراوەیە و چینێک دیوار بە ڕوویدایە، بەهۆی دەفتەر و یادنووسەکانی فەتانەی غەمگین و گێڕانەوەکانی نەسرەدینی بۆنخۆشەوە، چین بەچینی گێڕانەوەکە تەواو دەبێت.

بە پاڵەوانبوونی خەندان لەم ڕۆمانەدا گرنگی خۆی هەیە، تا ئەو ئاستەی دەتوانین بەوپەڕی بوێرییەوە لە هەموو ئەو ڕۆمانە کوردییانەی دی جودای بکەینەوە، کە نووسەرانیان پیاون و وەگێڕەکانیان ژنن، چونکە لەم ڕۆمانەدا بە تێپەڕینی ڕووداو و لە ناو تەکنیک و هونەری نووسین و پلۆتسازیدا، هەست بە تێمای ئەم ڕۆمانە دەکەین و دیدی بەختیار عەلی دەبینین، سەبارەت بە ژن، وەک بوونەوەری ناو ڕۆمانەکانی، دواجار ژن وەک بوونەوەری کۆمەڵایەتیش.

ڕەنگە بەختیار عەلی یەکێک بێت لەو ڕۆماننووسە دەگمەنانەی کورد، کە لە ئێوارەی پەروانەدا ژن وەک ڕەگەزێکی لاواز و نەخۆش و قوربانی گەمژەیی خۆی نیشان نادات، وەک بوونەوەرێکی ئاڵۆشاوی و سێکسییش نایبینێت و قورساییەکەی لە پانتایی ڕۆماندا وەک مرۆڤە. بەدەر لەوەش کە ژن تەنها وەک مرۆڤێکی ئاسایی وێنا بکات، ئەگەر پەروانە و کچەکانی تر سیمبولی مێینەیی بن لە هەست و سۆز و عەشق و ئومێد و هەڵوەدانبوون بۆ بوون بە مەعشووق و ژن و دایک، ئەوا لێرەدا خەندانی بچکۆلە دەکات بە بونەوەرێکی کامڵ و خاوەن مەعریفە، کە لە تەواوی ڕۆمانەکەدا بێهاوتایە و ئەم بێهاوتاییەش دەیکاتە پاڵەوان.

دیارە کارکردن لەسەر وەها کارەکتەرێک هەندێکجار نووسەر ڕووبەڕووی ڕەخنە دەکاتەوە، بەوەی ئایا بە پێی ئەو هەلومەرجە دواکەوتووەی لە ناو فەزای ڕۆمانەکەدا هەیە، ئایا دەشێت کەسی قسەکەر بەختیار عەلی نەبێت و خەندان بێت؟ ئایا ئەوە ڕاستەوخۆ بەختیار عەلییە قسە دەکات و خۆی ناو ناوە خەندانی بچکۆلە؟ یان تەواو هێنانەگۆی کارەکتەرێکی کچە لە ناو کولتووری کوردیدا، بە هەمان خەسڵەت و تایبەتمەندێتییەوە؟ دیارە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش خودی گێڕانەوەکانی



**جەبار جەمال غەریب**

ڕووداوەکە بەسن. ئەو دەمەی خەندان دوای بڕینی تەمەنی منداڵی و دوای چەشنی ناخۆشییەکان و دروستبوونەوەی لە ناو قوتابخانە ئایینییەکەدا بە تێڕامان و لێوردبوونەوەکانی، دەست دەکات بە نووسینەوە و داڕشتنی ڕووداوەکان بە جۆرێک کە تەواو هەست بە سروشتیبوونی گوتەکانی دەکەین. بێ زۆرلەخۆکردن و زیادەڕەوی، ئەوە خەندان خۆیەتی، کە گەشە دەکات و چیرۆک دەگێڕێتەوە. خەندان وەک پیاوانی ئاینی دین وەرناگرێت. ئەو بە چاوێکی ترەوە سەر لە نوێ خودا و ئاین و مرۆڤ و عەشق دەبینێت و بەردەوام ئەو تێڕوانینە نوێیەی وا دەکات جوانی لە شتەکاندا ببینێت، لە خودا و لە ئاینیشدا کە وەختانێک ئازاری دونیایان پێداوە! ئەم بینینەی نووسەر بۆ ژن بە باڵابینی ژنە و تەنها تەماشاکردنی نییە وەک قوربانییەکی دەستەپاچە، بەڵکو لەو قوربانییەوە دەبێتە پاڵەوانێک کە فریادڕەسی خودی خۆی و هەستەکانی بە چەشنێک کە وێنەیەکی دەگمەنی پێدەبەخشێت.
لە کارەکانی دیکەی بەختیار عەلیشدا هەمیشە نموونەی ئەو چەشنە ژنانە هەیە. نووسەر لە لایەکەوە ئەم کارەکتەرانە بەکار دێنێت بۆ ئەوەی بڵێت کۆمەڵگەکەم دەشێت خانمی وەهای تێدابێت، کە من وەک مرۆڤ دەیانبینم و هاوتایان دەکەمەوە، لە لایەکی تریشەوە، لە ڕووی مەعریفی و جیهانبینییەوە، لەڕێی نیشاندانی ئەوانەوە نووسەر خۆی دەبێتە ڕەخنەگرێک بۆ چەشنە ژنێکی دی، کە بەندی خۆیانن و لە ناو ڕووکەشگەرایی شتە ئاساییەکاندا خەریکی تێپەڕاندنی ژیانن. لە ڕۆمانی (کۆشکی باڵندە غەمگینەکان)دا (سەوسەنی فیکرەت گوڵدانچی) خاتوونێکە دەیەوێت لە ڕێگەی دونیای کتێبەوە دونیای ڕاستەقینە بناسێت. ئەم خانمە بە هۆی ئەو جادووەی فرەزانی زانستەوە، کچانی دیکە خۆشیان لێنایەت، کچانێک کە وەک نووسەر لە ڕۆمانەکەیدا دەڵێت: (هەرچەند مکیاژیان دەکرد و دەیانویست شاریانە دەرکەون، بەس سیماین هەر گوندەکییانە دەینواند)، ئەم تێڕوانینە لە لایەک ڕەخنەییە و لە لایەکی دییەوە ستایش و دەرخستنی ئەو چەشنە خانمانەیە، کە بوونیان هەیە و گرنگن (نموونەیەکی تر دەشێت کارەکتەری تریفە یابەحری بێت لە ڕۆمانی غەزەلنووس و باغەکانی خەیاڵدا، کە هەمان تایبەتمەندیی هەیە). ئەمەش دەبێتە ناسنامەیەک بۆ بەختیار عەلی، کە ئەو دەتوانێت ڕەگەزی مێ بە مانای ورد و تەواو وەک مرۆڤ ببینێت، چۆن کارەکتەرە پیاوەکانی وەک محەمەدی دڵشوشە یان غەزەلنووس یان جەلادەتی کۆتر کەسانی بەئاگان، ئاوهاش خانمەکان بەئاگان.



لە ناو ئەدەبی کوردیدا نووسەرانی دیکە هەن، کە وەگێڕەکانیان ژنن و لە خۆیان و خواستەکانیان دەدوێن (کە ئێمە پێشتر ئاماژەمان پێداوە) وەک لە چیرۆکی «پیاوی مەرمەڕ یان ئەفسونی شین»ی جەبار جەمال غەریبدا دەبینرێت. پلۆتی ئەم چیرۆکە لە ڕووی هونەرییەوە گێڕانەوەی فلاشباگی نییە وەک ئێوارەی پەروانە، بەڵکو بە شێوەی شەپۆلی هۆش نووسراوە. کەسی وەگێڕ ڕووداوەکان بۆ خۆی باس دەکات و بە شێوەی مۆنۆلۆگ دەدوێت. ئەم حکایەتخوانە ناوەکەییە بەهەمان شێوەی ئێوارەی پەروانە ژنە، بەڵام بە جیاوازیی ئەوەی ئەمە چیرۆکێکی درێژە و لەتەکیشیدا گێڕانەوە وەک مۆنۆلۆگی ڕاستەوخۆی کەسی یەکەمە، واتە ئەو



دەمەی نووسەر دەگێڕێتەوە (جەباری پیاو نییە) بەڵکو ژنێکە و باسی خەون و خولیای خۆی دەکات. کورتکردنەوەی گێڕانەوەی چیرۆکەکە لە پیاوی مەرمەڕدا بەم شێوەیە دەست پێدەکات: (من هەر ئەوەم لە بیرە کابرایەکی چاوڕژاوی ڕیش سپی، ئەسپێکی ڕەشی باغەی بە دەستەوە بوو لە دەرگاوە سەری هێنابووە ژووریّ و دەیگوت: ئەو ئەسپۆکەیە هی منداڵەکەی ئێوەیە. من لە هەموو تەمەنما پیاوم پێ جوان بووە، بەڵام نە بازن بووە لە دەستی بکەم و نە گوارە لە گوێی کەم و نە سوتیان لە مەمک). بەم شێوەیە لەو دەمە ئاساییەی ڕووداو دەدوێت، کە پیاوێک بە ئەسپێکی باغەی یاریی منداڵانەوە هاتووەتە بەر ماڵیان و ئەویش ئەسپەکەی لێدەبێتە ڕاستی و ڕووداو برەو دەسەنێت: (من بێ پەروا دەستم بۆ ئەسپە باغەکە درێژ کردوو پەتە چکۆلەکەم هاتە دەست، پەتێک کە کرابووەوە ملی ئەسپەکە، وەختێکم زانی لە پڕ هەنکەی ئەسپەکەم لە دووە، من ئەو ڕۆژە ماکسییەکی سووری سنگ پڕ نەخشم لەبەردا بوو، ئەوانەی بەلامدا تێدەپەڕین و دەیان ڕوانیە ئەو ئەسپەی ئەوسارەکەیم بە دەستەوە بوو، چەند کەسێک لەسەر سەکۆیەک دانیشتبوون.) ڕووداو دەبێت بە شتێک وا هەست دەکەین ئەمە ڕاستەقینەیە. لە پارچەی یەکەمدا کچەکە بە ماکسییەکی سوورەوە، بەسەر ئەسپێکی ڕەسەنەوە، بەرەو کۆشکی ڕەونەقدار دەچێت، لە دەروازەیەکەوە دەچێتە ژووریّ، دەنگێک پێیدەڵێت: (شازادەخانم گەیشت). خەیاڵات و گێڕانەوە لە ناو کەشێکی پڕ لە پیاودایە. نووسەر بە زاری قەیرەکچێکەوە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، بەڵام گێڕانەوەکان بەچەشنێک توندن هەست دەکەین

ئەمە پیاوێکە لەپشت دێڕەکانەوە، نەک خودی ژنێک و هەست بە ناسرووشتییەتی (تەسەنوعی) گێڕانەوە دەکرێت: (لە ناکاو دەرگایەک کرایەوە و هاڵاوی کۆمەڵە پیاوێک تێکەڵ هەوابوو، پیاوانی گەورە هەستابوونە پێ و یەکە یەکە لە باوەشیان دەکردم، من زۆر بە ناز و ناسکی، بەڵام بە ئیشتیاوە دەچوومە باوەشیان و بە ئاستەم ماچیان دەکردم). پاش نیشاندانی وێنەی ئەو کۆڕە پیاوانەیە، کە ئەم بە شەهوەتەوە تێیدایە، پارچەیەکی تری گێڕانەوە دەست پێدەکات، تیایدا باسی ڕابردوویەکی دی دەکات، کە چەندە تامەزرۆی کەسێک بووە جارێک نامەیەکی بۆ ناردووە شەش ساڵ نەیخوێندووەتەوە. ئەوەی لەم بەشەدا دەبینرێت ئەو دژیەکییەیە کە نووسەر تێیدەکەوێت، چونکە لە زاری کچێکەوە دەدوێت و هاوتا بیر و تێڕوانینی بۆ ژن پیاوانەیە. پێشتر دەڵێت: (من تا تەمەنی سی و پێنج ساڵی تاقە کەسێکم بە پیاو زانیبوو ئەو کەسەش تەنیا و تاکەجارێک نامەیەکی بۆ ناردم). پاش دوو پەرەگراف دەڵێت: (پەلەم بوو ماچین بڕوات و نامەکە بکەمەوە، هەر کە ڕۆشت خیرا بەرەو نامەکە چووم، پشتییەکەم وەک دڵێکی لە بن بێ دەجوڵا، شەرم گرتمی و سورهەڵگەڕام کە بچمە نێو نوێنی پیاوێکەوە، ئاخر من هێندە تامەزرۆی پیاوم لە ڕاست وشەیەکیان شاگەشکە دەبم و نازانم چم بەسەر دێ). ئەمە بەپێچەوانەی قسەی پێشوویەوەیە، ئەو پێشتر تا تەمەنی سیوپێنج ساڵی یەک کەسی بە پیاو زانیوە، لە گەنجیدا نامەی بۆ ناردووە، کەچی کاتێک دەیەوێت نامەکە بیخوێنێتەوە، باسی تامەزرۆیی بۆ پیاو بە گشتی دەکات، نەک پیاوە تایبەتییەکەی ئەم وێنای دەکات. بێگومان ئەمە

هەڵەی ئەو ڕووانینەیە کاتێک نووسەرانی پیاو بە زاری کچەوە دەنووسن، بێ ئەوەی مێیەتی و خواستە سێکسییەکانی وەک مرۆڤ دەرک بکەن، هەر بۆیە بە هەستی نێرانەوە ژن دەخەنە قسە. ئەم دیدەی جەبار جەمال بۆ ژن لە دیدە باوەکەی نووسەرانی تری کورد تێناپەڕێت، کە تەنها لایەنێکی ژنبوون و قەیرەبوون دەگرن، ئەویش لایەنی سۆز و خواستە سێکسییەکانیانە.

لە ڕۆمانی (ئەژدیها)ی محەمەد موکریدا هەمان تێڕوانین بەرهەم دەهێنێتەوە. بە سووک تەماشاکردنی ژن لە ناو دەقی ئەم ڕۆمانە ( ڕیالیزم_ ئەفسانەیی)ەدا بە هۆی ئاوێتەکردنی ئەفسانە و بابەتە ڕیالییەکانەوە قووڵتر دەبێتەوە. لەم دەقەدا زۆربەی ژنی کورد و تورکمانی دانیشتوی کوردستان بە ژنی سێکسخواز و ئاڵۆشاوی وێنا دەکرێن، تا رادەیەک کە کچە قەیرە و بێوەژنەکان سێکس لەگەڵ ئەسپدا دەکەن. نووسەر لێرەدا زاراوەیەک بۆ ئەم پرۆسەیە بەکار دێنێت کە لە ناو کومەڵگەدا بۆ سوکایەتیکردن بە ژن بەکار دێت ئەویش زاراوەی (ئەسپ لە خۆنان، یان پیاو لە خۆنان)ە. ئەمەش چڕبوونەوەی دیدی پیاوسالاری و کوردانەی موکرییە و دارشتنەوەیەتی لە ناو دەقی ڕۆمانەکەیدا. سەیر لەوەدایە پێدەچێت ئەم نووسەرانە پێیان وابێت، کە نیشاندانی ژن بەم شێوەیە لە چیرۆک و ئەدەبیاتی گێڕانەوەدا خزمەت بێت پێیان. ئەوان بێئاگان لەوەی، کە لە دەمی خوێندنەوەدا، هەر خوێنەرێکی وریا، بە تایبەت خوێنەری ژن، هەست بە نادروستی گێڕانەوەی ئەم بگۆیە دەکات، کە ژن نییە، بەڵکو پیاوە و لە بەرگی ژندا قسە دەکات.

جگە لەم چیرۆکە لە چەند چیرۆکێکی تریشدا ئەم دیدە بۆ لە مێ ڕوانین بەرچاو دەکەوێت. بۆ نموونە لە چیرۆکی نووسەران (هەورامان وریا قانع و نەجات نووری و ئاکۆ کەریم) و چەند نووسەرێکی دیکەدا هەستی پێدەکرێت، کە وەگێڕ کچە و نووسەر پیاوە. لە ئەدەبیاتی گێڕانەوەگەرییدا کاتێک نووسەر مێیە و بە زاری نێرەوە، یان نێرە و بە زاری مێینەوە، حیکایەتخوانی دەکات، دەبێت خودی خۆی لە یادبکات و ببێت بەو کەسەی کە حیکایەتخوانی چیرۆکەکەیەتی، بەڵام لە ناو ئەم دەستەیەدا ئەمە بەسەریاندا تێدەپەڕێت و هەر قسەی پیاوانە و وێنای خۆیان بۆ بیرکردنەوەی ژنان دادەنێن، بەبێ ئەوەی لە ڕاستیی ئەوە بگەن. بۆ نموونە هەمیشە کارەکتەرەکانیان دەکەنە ژنێکی ئاڵۆشاوی شەهوەتباز، بە ناوی قەیرەییەوە دەیدوێنن، وەک چۆن لای (جەبار جەمال غەریب) لە چیرۆکی (پیاوی مەڕمەڕ)دا بینرا. هەورامان وریا قانع لە چیرۆکی (سەرزەمینێکی تر)دا هەمان دیدی هەیە. چیرۆکەکە لە زاری کارەکتەری سەرەکییەوە دەگێڕدرێتەوە، کە باس لە دیداری خۆی لەگەڵ پیاوێکدا دەکات. قەیرەکچەکە لە بەیەکگەشتندا لەگەڵ پیاوەکە بەسەرهاتی خۆی باس دەکات، جگە لەوەی مەودای بە پاڵەوانبوون لێرەدا لاوازە و تەنانەت قوربانیبوونەکەشی هاوسۆزی خوێنەر بۆ خوی ڕاناکێشێت، هاوکات جۆرێک لە گومان لای خوێنەر دروست دەکات کە ئایا دەشێ شتێکی وەها روو بدات؟ ئەم کچە کە لە ماڵە بابێکی پڕ لە زوڵم و ستەمەوە هەڵاتووە، بە ڕێکەوت پیاوێک دەبینێت و پێکەوە دەچنە شوێنی ئەو پیاوە، کە زێدەتر لە کەلاوە دەچێت نەک ماڵ. لەوێ کچە لە ناکاو داوا دەکات ئەو پیاوە نەدیو و نەناسە ببێتە هاوجێگەی



شێرزاد حەسەن



و سێکسی لەگەڵ بکات، بەڵام پیاوەکە باسی ترس و دووری خۆی لەمێینە دەکات، کە ناتوانێت وەها هاوجێگەیی بکات. ئەم گێڕانەوەیە کچێکی قوربانی لە زاری خودی کچەوە نیشان دەدات، بەڵام ئێمە هەست دەکەین پیاوێک لە پشت ئەم دێڕانەوە وەستاوە، پیاوێک کە ناتوانێت و توانای دەرککردنی مێینەی وڵاتەکەی و ژنانی نییە و لە وێنای خۆیەوە دەڕوانێتە شتەکان، نەک لە کرۆکی خودی شتەکان و خواستەکانی ژنانەوە.

ئەم دیتنە بە چەشنێکی تر لای شێرزاد حەسەن دەردەکەوێت، کە هەمیشە لە ئەدەبدا بە داکۆکیکەر و نووسەری ژنان ناسراوە. لە دوارۆمانیدا (ژنێک بەسەر منارەوە) کەسی وەگێڕ نووسەرە و بەشێوەی مۆنۆلۆگی ناڕاستەوخۆ زمانحاڵی کارەکتەرێکی ژنە، کە قوربانیی دەستی سەرجەم کولتوور و دین و کۆمەڵگە و خۆیشیەتی. ئەم ژنە لە دوابەشی رۆمانەکەدا، لە دیالۆگێکی درێژدا باسی خۆی و چۆنێتیی ڕەنج و عەزابەکانی دەبێتە مۆنۆلۆگ و تەواو نموونەی مێ نیشان دەدات. ئەمە ئەو مێیە نییە بە دیدەکەی بەختیار عەلی لە ئێوارەی پەروانەدا، کە دیدی ژنێکی تێگەشتوو بوو وەک مرۆڤ، بەڵکو ئەمەی (شێرزاد حەسەن) ژنێکە کە لەتەک هۆشیاری و جیاوازبوونیدا لە کچانی تر، هێشتاش بە مانا باوەکەی هەر ژنێکە و لە ئاستی ئاسایی نەگوازراوەتەوە بۆ ئاستێکی باڵا، کە هەڵگری مەعریفەیەکی قووڵ بێت بۆ ژیان و بۆ دەوروبەر!

کارەکتەری ناو رۆمانەکە نەیتوانیوە لە ڕووداوێک تێپەڕێت کە بەسەر ژیانیدا هاتووە، ئەگەرچی ئەو ڕووداوە بە پێی فەزای ناو رۆمانەکە و زەمینەسازیی کارەکتەرەکە دەبوایە ئاسایی بوایە، چونکە دواجار ژنەکە بڕوای بە جیاوازبوون و مێگەلنەبوونی خۆی هەیە. ئەو بەسەرهاتەش لە دەستدانی کچێنیەتی بە خواستی خۆی لە لایەن خۆشەویستەکەیەوە. پاش ئەوەی کوڕەکە دەڕوات و ئەم لەناو نامیهرەبانییەکانی کۆمەڵگەدا و لە ناو ژیانی خۆیدا، کە وەک پاسەوانی منارەیەک دەمێنێتەوە، بەردەوام ئەو ڕووداوە وەک خاڵێکی ڕەش بەسەر ژیانی خۆیەوە دەبینێت. ئەمەش لە کاتێکدا کە کۆمەڵگە لەمە بێخەبەرن، ئەوە تەنها ڕازی نێوان خۆی و خۆشەویستەکەیەتی و دواجار بەو پیاوەش دەڵێت کە دەبێتە هاوسەری!

کارەکتەر لەبەر خۆیەوە (کە نووسەر بە ناوی دیالۆگەوە نیشانی دەدات، بەڵام لە ڕاستیدا مۆنۆلۆگە) دەدوێت و باسی ئەم بارە دەکات، پاش چەندەها ساڵ: (کچێک کە کەس نەیدەزانی بۆتە ژن دەبێت چی بکات؟ چی بکات دوای سەفەری خامۆشی و بێ گەڕانەوەی دڵدارە بێوەفاکەی لەودیو کێوەکان و زەریاکانەوە؟ چی بکات کە پیاوەکان جگە لە کچی جوانکیلە و مناڵکار و سەربەمۆر ئامادە نەبن قەیرە کچێکی وەک من بێ بنە بخوازن؟ کێ لێرە کچێکی دۆڕاو و کەوتوو هەڵدەگرێتەوە؟).

یاخود: (من وەک کچێکی بێ بن تەنها یەک نهێنیم بۆ ئەو پیاوە درکاند، کەچی ئەو نهێنییە هەموو ژیانی ڕشتە بەردەمم). ئەم بەشەی لەبەرخۆوەوە خۆدوواندن، جگە لەوەی ئاوازەی دەنگەکە و ترپەکەی ژنانەیە، بەڵام ناتوانێت ئەو بڕوایە لای منی خوێنەر بچەسپێنێت کە ئەمە دەنگی ئەو ژنە خۆیەتی. خۆ ئەگەریش بڕوا بکەین خۆیەتی ئەوە بانگەشەی ئازایی و بوێری و جیاوازبوونی پووچ

دەکەینەوە و تەنها وەک کارەکتەرێکی قوربانی، نەک پاڵەوان تەماشای دەکەین، کە بەڕای من قوربانی بیرکردنەوەی خۆیەتی!

جیاوازیی دیدی شێرزاد حەسەن بۆ مێ، وەک کەسی گێڕەرەوەی ڕووداوەکان، لەتەک بەختیار عەلیدا لەوەدایە، کە ژن لە نووسراوەکانیدا ناڕازییەکی دەستەپاچەیە. ئەم بوونەوەرە چەندە سەرکەش بێت و بیەوێت خۆی ڕاپسکێنێت لە زنجیر و کۆت و بەندی کۆمەڵگەی دواکەوتوو، دواجار وەک خۆیەتی و ناتوانێت ئازاد بێت، بە چەندان باڵیشەوە هێشتا توانای فڕینی نییە و لە سنووری ژنبوون بە دیدە باوەکەی ناو کولتووری کوردی نەگوزەراوە. لە کاتێکدا لە نووسراوی بەختیار عەلیدا، ژن لە قۆناغێکدا دەگاتە هۆشیاری و لەوێشەوە بەرەو کامڵبوون و ئاستی باڵای مرۆڤبوون هەڵدەکشێت. ئەو تەنها وەک ژنێک نامێنێتەوە کە هەڵگری دیدە باوەکە بێت بۆ خۆی و خۆی وەک بوونەوەرێکی غەدرلێکراو و پەراوێزخراو ببینێت، بەڵکو دەبێتە چاوێکی ئاگا و شرۆڤەکار بۆ هەموو ئەو دەمانەی لە ناو نائاگاییدا بووە و سەرلەنوێ بە شتەکاندا دەچێتەوە. کەسێتییەکی وەک خەندانی بچکۆلە لە دەمی باسکردنی ڕووداوەکاندا تەنها کەسی حیکایەتخوانی بێ هەڵوێست نییە، بەڵکو کچێکی پێگەشتووە و دەتوانێ خوێندنەوەی خۆی هەبێت بۆ ئەو شتانەی کە دیونی، دەرکی تری بۆ ڕووداوەکان هەبێت. لە جێیەکدا کە نەسرەدین باسی نائومێدییەکانی پەروانە دەکات، ئەو خوێندنەوەی خۆی بۆ هەیە و تەنها ڕووداو ناگوێزێتەوە لە زاری ئەوەوە: (ئەمڕۆ من دڵنیام کە نائومێدی پەروانە تەنها لە سرووشتە نازک و لاوازەکییەوە نەهاتووە، بەڵکو لەو دەستخەڕۆبوونەوە هەڵقووڵیوە کە لەگەڵ ئەو لێرەوارە و دارستان و چۆمەدا تووشی هاتووە). لە جێیەکی تردا بەسەر ڕووداوەکانی تر و تەنانەت دیدی نەسرەدینی بۆ نخۆ شیشد ا دەچێتەوە: (من ئەمڕۆ وای دەبینم کە نەسرەدینی بۆنخۆش بە شێوەیەکی زۆر یەکلایەنە و سادە سەیری حەقیقەتی کردووە، ئەو هەموو فەلسەفەی خۆی بۆ عەشق و مرۆڤ لەسەر ویساڵ و بەیەکگەیشتنی ئەڤینداران پێکەوە نابوو.. گرفتی گەورەشی ئەوە بوو کە نەیدەتوانی تێبگات چۆن عەشق لە ناوەوە دەمرێت، چۆن عەشق لە ناوەوە دەکەوێتە ناکۆکی لەگەڵ خۆیدا). ئەم وتانە وەک دەنگ، ئاوازەیەکی دڵنیا و پشت بەخۆبەستووە، هاوکات هەست بە پێگەشتوویی کەسی قسەکەر دەکرێت. ئەو کەسێکە کە توانای تەفسیر و چوونەوەی هەیە بە شت و کەسەکاندا و دەستەپاچەیەکی تەنها وەرگر نییە، بەڵکو وەرگری وریای هەموو شت وەرنەگرە، کە دەسەڵاتی حوکمدان و گێڕانەوە و ڕوونکردنەوەی هەیە!




جیاوازیی ئەم دوو دیدە و دروستبوونی وەها ڕوانینک، لە کارەکتەرسازیی هەردوو نووسەرەوە دێت، ئەو دەمەی کارەکتەرەکان دەئافرێنن و ڕۆڵی پێدەدەن.



تایبەتمەندیی کارەکتەر لەڕێی پێگە و فەزا و کەشی ناو ڕووداوەکانەوە دەردەکەوێت. لەم بارەیەوە (ڕۆبەرت مەک کی) لە باسی کارەکتەرسازیی نێو گێڕانەوەگەریدا باس لەوە دەکات، کە تەنها لە بارێکدا دەتوانرێت پەی بە کەسێتی ببرێت، ئایا ڕاستگۆیە، درۆزنە، بەهەڵوێستە، ئازا یان ترسنوکە، ئەویش لەو کاتەدایە، کە کارەکتەر بخرێتە ناو تەنگەژەی ڕووداوەوە. دیارە هەردوو کارەکتەرە مێیەکەی ناو ئەم دوو ڕۆمانەش، لە ناو ڕووداوەکاندا و بەهۆی تەنگەژەکانەوە کەسێتییانمان بۆ دەردەکەوێت. گەرچی هەردووی ئەم ڕۆمانانە بەجۆرێک لە جۆرەکان ڕەخنە لە دەسەڵاتی پیاوسالاری دەگرن، بەڵام لە ڕووی بیرۆکە و دانان و بە تەنانەت جۆری بیرکردنەوەی پشتی دەقەکانەوە جودان. دواجار دوو جۆر کارەکتەری ژن دێنە بەرهەم، کە لە دیدی نووسەرەکانیانەوە، دەزانین ژن لەم دەمەدا چۆن تەماشا دەکرێت. لای بەختیار عەلی ژن دەتوانێت بوونەوەرێکی دانا و خۆدروستکەر بێت، لای شێرزاد حەسەنیش یاخییەکی لە ناوەوە ترساو و نائومێد. لە (ژنێک بەسەر منارەوە)دا دەنگی کارەکتەری ژن پڕە لە خۆبەکەمزانین و خۆبەنەگبەتزانین، هاوتا دروستکردنی جۆرێک لە شانازییەک بۆ ئەو کڵۆڵییە، کە خودی کڵۆڵییەکە دەیکاتە پاڵەوانی ناپاڵەوان، پاڵەوانێک کە وەک ژنانی تر بە زاری خوی دەڵێت ئابڕووم تکاوە، دەڵێت بێبن کراوم: (دەزانم تاساویت و لە دڵی خوتدا لێکی دەدەیتەوە کە بۆ وا بێ پەردە قسە دەکەم و داخدارم، قسە لەسەر خەمی پەردە و بەفیرۆچوونی نیوەی ژیانم نا، دەکرێ بڵێم هەموو ژیانم). ئەم دەنگە پڕە لە نائومێدی و ئێستاش لە ترس، ئەگەرچی چرکەساتی گێڕانەوە باسی ڕابردوو دەکات، بەڵام لە دەمی ئێستای گێڕانەوەشدا نەیتوانیوە ئەو دەمانە تێپەڕێنێت و جۆرێک لە ئاسایش و ئارامی پێگەشتوویی بۆ خوی بئافرێنێ. ئەگەرچی هەندێک لە دیالۆگەکان هەوڵ دەدەن وەهای نیشان بدەن بەڵام ئەمە ناتوانێت خوێنەر بخاتە سەر ئەو بڕوایەی کە دیسانەوە لەگەڵی بێت و هاوسۆزی بێت!

بەشێوەیەکی گشتی دەشێت بوترێت لە دەقی ئەو نووسینانەی شەهرەزاد حیکایەتخوانە، دیدی نووسەرانی شەهریار دەردەکەوێت، کە ئایا دیدێکی فرەبین و ئاسۆدووورە، یان هەمان دیدی باوکسالارییە و نووسەران نەیانتوانیوە لە جوغزی باوکیان بۆ بیرکردنەوە لە ژن تێپەڕن. دیارە ئەمە بە پێی نووسەرەکان دەگۆڕێت و بەشێوەیەکی گشتیش کەم نووسەری پیاوی کورد هەن، کە بە پێی شیکاری ڕەخنەی فێمێنیزمی، نووسینەکانیان لە دیدی پیاوسالاری و دووبارە خوڵقاندنەوەی توندوتیژی بەرامبەر بە ژن و بەکەمڕوانین لێی ترازابن.

لەم وتارەدا جەختمان لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە بەختیار عەلی لەم بوارەدا قوڵبینە، بەڵام زۆرێک لە نووسەرانی تر لەگەڵ کارە باشەکانیاندا هێشتاش نەیانتوانیوە لە دەقە ئەدەبییەکانیاندا بە دیدێکی ترەوە بۆ ژن بڕوانن و بەم هۆیەشەوە جارێکی تر بوونەتە بەرهەمهێنەری وێنای باوی ژن، بەو شێوەیەی لە کۆمەڵگەی پیاوسالاریدا هەیە.





# قاڵبی هونەریی توخمی ڕووداو

## لە ڕۆمانی (جەمشید خانی مام کە هەمشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد)ی بەختیار عەلیدا

**حەمە مەنتک**

توخمی ڕووداو، وەکو توخمێکی سەرەکیی بونیادی هونەریی ڕۆمان، ڕۆڵی بەرچاوی لە بەهونەریکردنی ڕۆماندا هەیە. بێگومان هەموو ڕۆماننووسێک دەبێ لە هەوڵی ئەوەدا بێت واقیعێکی دیکەی هونەریی جودا لە ژیان بئافرێنێ، چونکوو لەوێوە هونەرییبوونی ڕۆمانەکە بەدیار دەکەوێ. بۆ ئافراندنی ئەم واقیعە ئەدەبی و هونەرییە، ڕۆماننووس سەرچاوەی جوداوازی لەبەر دەستدان وەکو: واقیعی ژیان، فەنتازیا، مێژوو (بە هەموو ڕووداو و کەسایەتییەکانییەوە). توخمی ڕووداو زۆر گرنگە، گرنگییەکەی لەوەدایە هیچ ڕۆمانێک



بەبێ ڕووداو نابێ. بۆ ئەم توخمە لە زووەوە وەکوو تیۆری باسی کراوە. ئەرستۆ لە کتێبی (هونەری شیعر)دا لە باسی تراژیدیادا دەڵێت: (تراجیدیا بریتییە لە لاسایی کردنەوەی کردەوەیەکی سەنگین و لەخۆیەوە تەواو پێگەیشتوو کە درێژییەکی دیاری هەیە.))١ لێرەدا ئەرستۆ داوای یەکێتیی ڕووداو دەکا، ڕووداوەکەیش دەبێ لاسایی کردەوەی مرۆڤ بێ، کردەوەکەیش دەبێ کردەوەیەکی جوان و سەنگین بێ، نەک کردەوەی خەراپ، دەبێ سەرەتا و کۆتایی و ناوەڕاستی هەبێ، کۆتاییەکەی دیار و ئاشکرا بێ. ئەم هەمووو مەرجانە بۆ توخمی ڕووداو لە سەردەمی یۆنانییەکان زیاتر بۆ شانۆگەرییەکانیان تەرخان کراوە، بەڵام (هۆمیرۆس) یەکەم کەسێک بوو ئەم زنجیرەییبوونەی ڕووداوی لە (ئەلیادە و ئۆدێسە)دا تێکشکاند و ڕووداوەکانی لە ناوەڕاستەوە گێڕایەوە. بۆ باسکردنی توخمی ڕووداو بە شێوەیەکی تیۆری هەویرێکە ئاو زۆر دەکێشێ، چونکوو بە پێی ژمارەی تیۆرناسان پێناسە و ڕاڤەمان بۆ توخمی ڕووداو هەیە، بۆیەیش لەم نووسینەدا بواری ئەوە نییە بە شێوەیەکی تیۆری توخمی ڕووداو باس بکەین، یان بنیاتەکانی ڕوودا وەکوو (بنیاتی شوێنکەوتە، بنیاتی تێهەڵکێش، بنیاتی هاوسەنگ، بنیاتی بازنەیی) و شێوازەکانی گێڕانەوەی ڕووداو لە ڕۆمان باس بکەین. بەڵکە ئامانجی ئێمە لەم نووسینە ئەوەیە، بە شێوەیەکی زانستی توێژینەوە لە هونەریبوونی توخمی ڕووداو لە ڕۆمانی (جەمشید خانی مامم....) بکەین. ئایا بەختیار عەلی چۆن ڕووداوەکانی وەرگرتووە؟ ئایا ڕۆماننووس توانیوتی واقیعێکی دیکە لە نێو ڕۆمانەکە بئافرێنێ؟ هونەریبوونی ڕووداوەکانی نێو ئەم ڕۆمانە لە کوێدایە؟ هەوڵ دەدەین لە ڕێی وەرامدانەوەی ئەم پرسیارانەوە بچینە نێو دەقەکە، مێتۆدی بونیادگەری بۆ ئەم نووسینە پێڕەو دەکەین و لە چوارچێوەی ڕۆمانەکە ناچینە دەرەوە.

پێشتر باسمان لە سەرچاوەکانی وەرگرتنی ڕووداو کرد. بە بۆچوونی (عەتا نەهایی) وەرگرتنی ڕووداو بە دوو شێوە دەبێ:

١.ڕووداوی واقیعی: ئەو ڕووداوانەی لە نێو ژیانی ڕۆژانە و واقیعدا بوونیان هەیە.

٢.ڕووداوی فەنتازی: ئەو ڕووداوانەی لە واقیعدا بەرجەستە نین.٢

کەواتە ڕۆماننووس لە بەردەم دوو ئەگەردایە، یان ئەوەتا کەرەسەی ڕووداوەکان لە واقیع وەردەگرێ، ئەو ڕووداوەی لێرەدا وەری دەگرێ ڕەنگە لە ڕابردوو ڕووی دابێ، یان لە ئێستادا هەیە، ڕەنگە لە داهاتوودا ڕووبدات، یان ئەوەتا ڕووداوێکی فەنتازییە و خەیاڵی دەیئافرێنێ، بە سوودوەرگرتن لە ئەفسانە و حەکایەتە فۆلکلۆرییەکان. نموونەی ئەو ڕووداوە لە واقیعدا بوونی نییە، بەرجەستە نییە.

(غەمگین بۆڵی) لە نووسینێکی کورتیدا باس لەوە دەکا: دوو شێوازی گێڕانەوەمان لە نێو چیرۆک و ڕۆمانی کوردیدا هەیە، یەکیان شێوازی گێڕانەوەکان زۆر واقیعین، دووەمیان شێوازی گێڕانەوەکان زۆر خەیاڵین.٣ بەڵام هەڵەی (بۆڵی) لێرەدا ئەوەیە، وەرگرتنی ڕووداو و شێوازی گێڕانەوەی تێکەڵ کردووە. وەرگرتنی ڕووداو بەو دوو شێوەیەی سەرەوە دەبێ، کە باسمان کرد، بەڵام دوو جۆر شێوازی گێڕانەوەمان هەن، ئەوانیش شێوازی گێڕانەوەی بابەتی و خودین. لە شێوازی گێڕانەوەی بابەتیدا، وەگێڕ (الراوی) وەگێڕێکی هەمووشتزانە، دەسەڵاتی

تەواوی بەسەر کارەکتەرەکان، ڕووداوەکان، کات و شوێن و تەنانەت لەبری کارەکتەرەکان بیریش دەکاتەوە، لێرەدا گێڕانەوەیەکی تاکدەنگمان هەیە. هەرچی شێوازی گێڕانەوەی خودییە، ئەم جۆرەیان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە پەیدا بوو، کاتێک (گۆستاف فلۆبێر) داوای لە ڕۆماننووسان کرد ڕێ بە کارەکتەرەکان بدەن خۆیان هەست و تێڕوانینی خۆیان دەرببڕن. لێرەدا وەگێڕ خۆی بەشدارە لە نێو ڕووداوەکان، جا ئەم گێڕانەوەیە یان خۆدواندنە، یان لە ڕێی دیالۆگەوە دەبێ، یان لە ڕێی کارەکتەرێکەوە. کەواتە ئەوەی وا دەکا ڕۆمانێک زۆر واقیعی بێ، ناهونەرییە لە وەرگرتنی ڕووداوەکان، نەک شێوازی گێڕانەوە، چونکە ڕۆماننووس دەبێ ئەدەب بئافرێنێ، توانای قەناعەتپێکردنی خوێنەری هەبێ.

لە ڕۆمانی (جەمشیدخانی مامم...)دا، وەرگرتن و لە قاڵبدانی ڕووداوەکان ئەو ئێستاتیکایەیان نییە، کە ڕۆماننووس لە ڕۆمانەکانی دیکە ئافراندوونی. لەم ڕۆمانەدا سەرچاوەی وەرگرتنی ڕووداوەکان واقیعی ژیانن، زۆربەی ڕووداوەکانیش ڕابردوون، لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆر شوێن پەنای وەبەر ڕووداوی فەنتازی بردووە. ئەم ڕۆمانە کارەسات و ڕووداوی نزیک بە (٢٥) ساڵ دەگێڕێتەوە. هەر لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە تاکو سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠). کارەسات و ڕووداوەکانی: جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران، ڕاپەڕینی ١٩٩١ی کورد، شەڕی براکوژی، گرانی و ئابڵوقەی ئابووریی نەوەدەکان، بڵاوبوونەوەی بیری ئیسلامی سیاسی لە نێو گەنجان، کۆچی گەنجی کورد بۆ ئەورووپا. ئەم ڕووداوانە هێندە واقیعییانە کاریان لەسەر کراوە کاریگەریی ناهونەریی بۆ سەر بونیادی ڕۆمانەکە هەبووە، چونکوو هێندە بە گشتی ئەو ڕووداوانە گێڕدراونەتەوە فەزای هونەریی ڕۆمانەکەی کوشتووە. هەریەک لەم کارەسات و ڕووداوانە لە سەدان وردە چیرۆک و ڕووداو پێکهاتوون، یەکێک لە کێشەی وەرگرتنی ڕووداو، وەکو توخمێک لە واقیع بۆ نێو ڕۆمان ئەوەیە، بە شێوەیەکی گشتی ڕووداوەکە وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر بنۆڕین هەریەک لەو ڕووداوانە وردە ڕووداو و چیرۆکی جوانی تێدا هەن، کە ساناتر دەتوانرێ ئێستاتیکا و واقیعێکی دیکەیان لێ بئافرێنرێ. (چیرۆک و ڕۆمان لە ناخ و جەوهەری خۆیدا داهاتەیەکی ستاتیکی و جوانکارانەیە، لە کاتێکدا کارەسات واقیعێکی تاڵ و دژە مرۆڤانەیە، کە هیچ جوانییەکی تێدا نییە.)٤ لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی شەڕی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران، ڕووداوەکانی بە شێوەیەکە زۆر وشک دەخوێندرێنەوە. لە نێو ئەو شەڕەدا وردە چیرۆک و ڕووداوی زۆر کاریگەرمان هەن. وردەکاری بە شێوەیەکی هونەری لە چنینی ڕووداوەکانی ئەو جەنگە نابینرێت، بەڵام ئەگەر تەماشای ڕۆمانەکانی دیکەی ڕۆماننووس بکەین، ئەو وردەکارییە لە چنینی ڕووداوەکان بەرچاو دەکەون.

(ئەو شەوە لە دەمەوبەیانەوە و بە درێژایی ڕۆژیش تۆپخانەکانی عێراق و فڕۆکە جەنگییەکانی سوپا ئەو شوێنە نهێنانەیان کوتا کە مامە جەمشدیم دەستنیشانیکردبوون.)٥ ئەگەر سەیری ئەم وێنەیە بکەین زۆر ڕووت و واقیعیی دێتەبەرچاو، چونکە هەر خوێنەرێک لە هەشتایەکان ژیابێت ئەوە دەزانێت ئەم شەڕە چۆن بووە، یان ئەو خوێنەرانەی لە باوکیان، یان برایان بیستووە لەبارەی ئەم




لە ڕۆمانی (جەمشیدخانی مامم...) دا، وەرگرتن و لە قاڵبدانی ڕووداوەکان ئەو ئێستاتیکایەیان نییە، کە ڕۆماننووس لە ڕۆمانەکانی دیکە ئافراندوونی. لەم ڕۆمانەدا سەرچاوەی وەرگرتنی ڕووداوەکان واقیعی ژیانن، زۆربەی ڕووداوەکانیش ڕابردوون، لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆر شوێن پەنای وەبەر ڕووداوی فەنتازی بردووە



جەنگەوە. قاڵبی هونەری بۆ وەرگرتنی ڕووداو، دەبێ بە شێوەیەک بێ (ئەگەر ڕووداوەکە لە واقیعەوە وەرگیرابێ)، وا لە خوێنەر بکا، ئەو بیرە بخاتە مێشکی خوێنەرەوە، کە بەڵێ ئەو ڕووداوەی لە شوێنێک بیستووە، بەڵام بەو شێوە ئێستاتیکییە نا، یان وای لێ بکا دەشێ ڕووداوێکی وا ڕووب دا. کاتێک ڕۆمانی (دەمێ مەرگ دەمێ خشەویستی) ی (ئێریش مارییا ریمارک) دەخوێنینەوە، ئەویش ڕووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانی دەگێڕێتەوە، بەڵام لە کۆی ڕووداوە گشتییەکانی شەڕەکە، دیمەنێکی بچووک، کە خۆشەویستیی نێوان سەربازێک و کچێکە دەگێڕێتەوە، لەوێ چنینی ڕووداوەکان وردەکاریی تێدایە، بەڵام لە جەمشید خاندا لە هێندێک شوێن ئەگەر خوێنەر پەرەگرافێک لاببات، کێماسی لە گێڕانەوەکە دروست نابێ. ئەویش بە هۆی درێژی کاتی گێڕانەوەوەیە، لەو ماوەیەشدا ڕووداوەکان زۆرن، ناچار بە زۆر لە پاڵ یەکدی پەستێنراون، ناچار وەگێڕی ڕۆمان زوو زوو کاتی ڕۆمانەکە دەباتە پێش و بەسەر ڕووداوەکان بازدەدا. زوو زوو خوێنەر بەر دەستەواژەی (دوای سێ هەفتە، دوای شەش مانگ، چەند ساڵێک دواتر، لە هەفتە و مانگەکانی داهاتوودا، لەو چەند ساڵەی جەنگدا...تاد) دەکەوێ. ئەمەیش بازادانی وەگێڕە بۆ گەیشتن بە ڕووداوەکانی دواتر، لە هەر یەکێک ڕووداوێک بە شێوە گشتییەکەی گێڕدراوەتەوە.

لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی کۆچی گەنجانی کورد بۆ ئەورووپا، بەهەمان شێوە، گێڕانەوەی ڕووداوەکان زۆر کرێت و ڕووتن، هەست دەکەی خەیاڵی هونەریان تێدا لاوازە، چونکە ئەو ڕێیە قاچاغەی خەڵک پێیدا بۆ ئەرووپا دەڕۆیشت، هێندە باس کراوە لەلایەن ئەو کەسانەی سنوورداش دەکرانەوە، ئەوەی سەفەریشی نەکردووە شارەزا بووە. ئەگەر نموونەی ئەو ڕووداوەی دەیگێڕدرێتەوە لە واقیعیشدا هەبێ، کارکردنی ڕۆماننووس لەسەر ئەو پانتاییانە هونەریترە کە فەرامۆش کراون، چونکە لەوێدا خەیاڵی ڕۆماننووس دەتوانی ساناتر گەمەکانی خۆی بکا. (مێژوو ڕووداوە گەورەکان، دەسکەوت و شکستەکان دەنووسێتەوە – دیارە زۆرجار بە درۆ و شێوێندراوی. ئەوە کاری چیرۆکنووس و ڕۆماننووسە بگەڕێنەوە سەر ئەو ڕووبەرە فەرامۆشکراوانە و کاری تێدا بکەن)٦ بەو واتایەی مێژوو زێتر کار لە ڕووبەرە گشتییەکان بۆ گێڕانەوە دەکا، بەڵام ڕۆمان بە هۆی خەیاڵەوە کار لەسەر ئەو ڕووبەرانە دەکا، کە نادیارن، فەرامۆشکراون، هەموو خەڵک پەی پێ نەبردووە. بۆ نموونە لەم ڕۆمانەدا زۆر بە گشتی ڕووداوی قاچاغچی و ژیانی ئەو گەنجانەی بۆ ئەورووپا دەڕۆن گێڕدراوەتەوە.

(شەوێکی هاوین بە هەموو نەفەرەکانمانەوە بەرەو سنوور کەوتینە ڕێ، پەتی تەواومان کڕیبوو، ڕێنمایی تەواومان دابوو بە نەفەرەکان. لەسەر سنووری یۆنان دابەزین و لە شاخ و جەنگەڵستانێکی گەورەدا لە خاڵێکەوە کە زۆر دوور نەبوو لە سنووری بولگارستان دابەزین لەسەر سنوور هەموو نەفەرەکانمان لە ترسا دەلەرزین و منیش دەلەرزیم....)ل١٠٥ گێڕانەوەی ڕووداوی بڕینی سنووری نێوان دوو وڵات پڕ لە زەحمەتی و ناخۆشییە، بەڵام وەگێڕ هێندە بە ئارامی و سانایی باسی دەکا، خوێنەر چ ململانێیەک هەست پێ ناکا. ململانێی ڕووبەڕووبوونەوەی سەختیی ئەو ڕێیە، بەڕاستی زۆر لەو کەسانەی

بەوێدا ڕۆیشتوون بە شێوەیەکی سەیر باس لە زەحمەتییەکانی ئەو ڕێیە دەکەن. لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە ئەوەی فۆرمالیستەکان ناویان نابوو (ناباوکردن) بەرچاوناکەوێ. (دۆزینەوە و باوەڕی فۆرمالیستەکان لەمەڕ دیاردەی نامۆکردن یارمەتیدەری تێگەیشتنە لە پێکهاتەی ئەدەب بە گشتی و ڕۆمان بە تایبەتی و شێوەی ئافراندنی ئەدەبی لەسەر بنەمای بە لاڕێبردنی خوێنەر لەلایەن نووسەرەوە بەهۆی تێکەڵکردنی واقیعی بەرهەست و نابەرهەست و گێڕانەوەی ڕووداوگەلی ڕابردوو یاخۆ ڕووداوگەلی شیاوی وەدیهاتن لە ئێستا و داهاتوو.)٧ سوودوەرگرتن لە ڕووداوەکانی واقیع و ژیانی تاکەکەسی، کارێکی بەجێیە، بەڵام گێڕانەوە و گواستنەوەی ئەو ڕووداوانە بۆ نێو کارێکی ئەدەبی لە چەشنی ڕۆمان، یان چیرۆک، دەبێ ناباو بکرێ. واتە خوێنەر کاتێک ئەو ڕووداوانە دەخوێنێتەوە هەست بە چێژی ئەدەبی بکا. گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی گەنجی کورد لە ڕێی قاچاغی تورکیا و یۆنان بۆ کەسێکی وەکوو من کە نەمدیوە، چێژی خۆی هەیە، بەڵام بۆ کەسێک کە بەو ڕێیەدا ڕۆیشتبێ هیچ چێژێکی نییە، چونکوو لە واقیعدا ئەو کەسە دیویەتی.

کەواتە یەکێک لە کێشەکانی وەرگرتنی ڕووداو وەکوو توخمێک بۆ ڕۆمان لە ڕۆمانی کوردی بە گشتی (تاک و تەرا نەبێ) و ئەم ڕۆمانە بە تایبەتی زۆر واقیعییانە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە. بەبێ ئەوەی هەوڵی دابێ واقیعێکی دیکەی لێ بخولقێنێ، یان ئەو هەستە لە کن خوێنەر دروست بکا، ڕەنگە ڕووداگەلی لەم چەشنە لە ئێستا و داهاتوودا ڕوو بدا.

کێشەیەکی دیکە وەرگرتنی ڕووداو لە ڕۆمانی کوردی بە گشتی و ئەم ڕۆمانە بە تایبەتی، بێ سنوور فەنتازیبوونی ڕووداوە. بێگومان لە ڕۆماندا فڕینی مرۆڤ، خواردنی ئاسن، زیندووبوونەوەی مردوو، قسەکردنی مردوو...تاد، هەمووی ڕەوایە. بەڵام ڕۆماننووس چۆن ئەو قەناعەتە لە لای خوێنەر دروست دەکا، کە ئەم ڕووداوانە ئاسایین. لە ڕۆمانی (نهێنی یاری کاغەز)ی (یۆستاین گاردەر)، لەوێدا کاغەزەکانی یاری قومار وەکوو مرۆڤ قسە دەکەن، دەجوڵێنەوە، کارگەی شووشەیان هەیە. ڕۆمانی (پیدرۆ پارامۆ)ی (خوان ڕۆڵفۆ) کاتێک وەگێڕ بە دوای باوکی دەچێتە گوندەکەیان، لەوێدا هیچ گوندێک بوونی نییە، خەڵکەکەیشی هەموو مردوون، بەڵام هەموویان قسە دەکەن، جووڵەی ژیان هەیە، ململانێ هەیە، تەنانەت وەگێڕیش دەمرێ، بەڵام قسەیش دەکا. هونەرمەندی ڕۆماننووس لەوێدایە قەناعەت بە خوێنەر بکا. ئەم ناباوکردنە لەم ڕۆمانەدا زۆر لاوازە، شتەکان بە شێوەیەک فەنتازی دەکرێن، گومان لە لای خوێنەر دروست دەکەن. وەکوو پێشتر ئاماژەم دا (بەختیار عەلی) زۆر هونەرمەندانە لە ڕۆمانەکانی دیکەی کاری لەسەر دیاردەی ناباوکردن کردووە، خوێنەر سەرسام دەکا، بە تایبەت لە (دواهەمی هەناری دونیا، غەزلنووس و باخەکانی خەیاڵ)دا. یەکێک لە کێشەکانی ئەم ڕۆمانە هەڵتۆقینی ڕووداوە لەناکاو، بەبێ ئەوەی زەمینەی بۆ خۆش کرابێ. لە ناکاو ڕووداوێک دەوستێ و یەکێکی دیکە دەست پێدەکا، بەبێ ئەوەی پێشتر هیچ ئاماژەیەک، هێمایەک بۆ بوونی ئەو ڕووداوە هەبێ. ڕایەڵ پەیوەندی لە نێوان بەشەکانی ئەم ڕۆمانەدا زۆر لاوازە، تەنیا ڕایەڵێک

یەکێک لە کێشەکانی وەرگرتنی ڕووداو وەکوو توخمێک بۆ ڕۆمان لە ڕۆمانی کوردی بە گشتی (تاک و تەرا نەبێ) و ئەم ڕۆمانە بە تایبەتی زۆر واقیعییانە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە. بەبێ ئەوەی هەوڵی دابێ واقیعێکی دیکەی لێ بخولقێنێ، یان ئەو هەستە لە کن خوێنەر دروست بکا، ڕەنگە ڕووداگەلی لەم چەشنە لە ئێستا و داهاتوودا ڕوو بدا






بزربوون و دیارنەمانی جەمشیدخانە لە کاتی فڕیندا، جارێک دەکەوێتە ئێران، جارێک پەکەکە هەڵی دەگرنەوە. (ئەو شەوە کە ژەندرمەکان گەمارۆیان داین و خان لە هەوادا بەربوو، با چەندین ڕۆژ هەر بە ئاسماندا دەیبات و داینانێت، بەسەر هەموو یۆناندا دەیگێڕێت، بەرەو دوور دەیبات و دەیهێنێتەوە، بەرەو دەریا دەیڕفێنێت و دەیخاتەوە سەرخاک، ئەو لە هەوادا دەبوورێتەوە و دێتەوە هۆش خۆی، دەخەوێت و هەڵدەستێت، خۆر دەبینێت هەڵدێت و خۆر دەبینێت ئاوا دەبێت کەشتییە گەورەکان دەبینێت تێدەپەڕن و کەشتییە بچووکەکان دەبینێت ڕاودەکەن... هەمیشەش بادەیبات و با دەیبات، لە ئاسمانەوە ڕۆخە دوورەکانی باکووری ئەفریقا دەبینێت، وەردەگەڕێ و دێتەوە بۆ باکوور لەنگەرێک نادۆزێتەوە. دوای شەوان و ڕۆژانێکی زۆر، کە نەکەس ژماردونی و نە بەکەسیش دەژمێردرێن، شەوێک لەناکاو هەوا دەگاتە وادەی پشووی خۆی خان لە ئاسمانەوە بۆ ناوەڕاستی دەریا بەردەبێتەوە.)ل١١٢- ١١٣

ئەم ڕووداوە بە شێوەیەک فەنتازییە، کە خوێنەر گومان لە بوونی دەکا، ئەوەی کە قەناعەت لە لای خوێنەر دروست دەکا و جێی باوەڕ بێ، هونەری و ئەدەبیبوونی دەقە، بەڵام ڕووداوێکی لەم شێوەیە ئەم دوو خاڵەی تێدا لاوازە. دەبێ خوێنەریش ئەوەی لە بیر بێ، ئێمە تەنێ لایەنی وەرگرتنی توخمی ڕووداو لە ڕۆمان بەر باس دەدەین، کارمان بەسەر دنیابینی و تێمەی گشتی و فیکری ڕۆمانەکەوە نییە. فەنتازیبوونی ڕووداو دەبێ لەگەڵ واقیع ڕایەڵەیەک بەیەکیانەوە ببەستێتەوە، چونکە لێرەدا دەبێ واقیع و خەیاڵ یەکتری تەواو بکەن.

(نموونە واقیعییەکان و خەیاڵ و خەون لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ دەبن و ئاوێتەی یەکتری دەبن.)٨

کەواتە کاتێک ڕۆماننووس ڕووداوێکی فەنتازی بە هاوکاری سوودوەرگرتن لە: ئەفسانە، حەکایەتی فۆلکلۆری، پەند...تاد، وەردەگرێ، دەبێ لەگەڵ واقیعی بگونجێنێ، هەموو گێڕانەوەکانی نێو ئەدەبیاتی ئەمریکای لاتینی، کە بە ڕیالیزمی جادوویی ناسراوە، لەسەر ئەم بنەمایە بەندە. ئامانجی ئەوەیش نیشاندانی ڕووداوی فەنتازییە لە بەرگی واقیع، واتا خوێنەر وای دێتە بەرچاو، ئەو ڕووداوە فەنتازییە واقیعە. ڕووداوە فەنتازییەکانی نێو ڕۆمانی جەمشیدخان تووشی سەرسووڕمانمان ناکەن، بەڵکوو تۆوی گومان لە کن خوێنەر دروست دەکەن، بە کورتی هێندە فەنتازییە تەواو لە واقیع دادەبڕێ، هیچ ڕایەڵێک بە واقیعی نابەستێتەوە. هەروەها سەرچاوەی ڕووداوە فەنتازییەکە دیار نییە.

لە کۆتاییدا قاڵبی هونەری توخمی ڕووداو لەم ڕۆمانەدا لە ڕووی هونەرییەوە لاوازە، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆمانەکانی دیکەی ڕۆماننووس. قاڵبی ڕووداوەکانیش لە لایەک هێندە واقیعییە، ئەو هەستە لە لای خوێنەر دروست دەکا، کە ئەو ڕووداوانەی دیتووە، یان بیستووە. لە لایەکی دیکە لە زۆر شوێن بە ڕووداوی هێندە فەنتازی دەکەوین، کە هیچ ڕایەڵەیەک بە واقیعی نابەستێتەوە و زۆر دووردەکەوێتەوە لە واقیع، ئەمەیش توانای قەناعەتپێکردن لە لای خوێنەر لاواز دەکا.

**پەراویز و سەرچاوەکان:**


١.هونەری شیعر، ئەرستۆ، و: عەزیز گەردی، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، سلێمانی،٢٠٠٤،ل٣٣.

٢.ئەم بۆچوونەی (عەتا نەهایی) لە کۆڕێک لە کتێبخانەی زەیتوونە لە شاری هەولێر لە ڕێکەوتی (٢٠١٢/٥/١٥) بۆی سازکرابوو، گوێمان لێی بووە.

٣.بۆ بەرچاوڕوونی بنۆڕە: سۆفیا لۆرین بە هەوێداری، غەمگین بۆڵی، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە:٥٦-٥٧، ل٢٨٢.

٤.تەوەرەی چیرۆکی کوردی، گێڕانەوەی کارەساتەکان، ئا: ئیدریس عەلی، گۆڤاری ئاینده ژمارە :٧٤، ٢٠٠٧، ل٨٢.

٥.جەمشید خانی مام کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، بەختیار عەلی، لە بڵاوکراوەکانی ئەندێشە، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٣٢.

٦.چاوپێکەوتن لەگەڵ عەتا محەمەد، ئا: هەرێم عوسمان، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژ:٥٦-٥٧، ئەیلول ٢٠١٢، ل٢٣٩.

٧.زمان، ئەدەب و ناسنامە، د.هاشم ئەحمەدزادە، دەزگای ئاراس، هەولیر، ٢٠١٢، ل١١.

٨.عناصر داستان، جمال میرصادقی، انتشارات سخن، چاپ پنجم، تهران، ١٣٨٥، ص٣٦٦.



# مانا مەجازییەکانی شوێن و مەرگی ئەشرەف

## لە مەرگی تاقانەی دووەمدا



نیهاد جامی

ئامادەبوونی شوێن لە تێکستی کوردیدا، ڕووبەرێکی نەخوێنراوەی بونیادێکی پێکهاتەی دەقە، بەهۆی ئەوەی کارەکتەرەکان لە نادیارەوە دێن، نووسەر کاریگەریی شوێن لەسەریان دەگۆرێت بۆ کاریگەریی دەنگی خۆی. شوێن ڕووبەرێکی جوگرافیی خەمناکی زیندەگیی مرۆڤ نییە وەک پۆل ئیلوار ئاماژەی بۆ دەکات، بەڵکو شوێن ئامادەبوونی منی نووسەرە لەناو کارەکتەردا، ئەوە وا دەکات تێکست لەناو یەکڕەهەند زیندەگیی خۆی بژیێت، ئەو تاکڕەهەندییە دەنگی کارەکتەر دەتوێنێتەوە لەناو دەنگی نووسەردا.

کەچی لە رۆمانی «مەرگی تاقانەی دووەم»ی بەختیار عەلیدا دەنگی کارەکتەر و شوێن ئەو هاوکێشەیەی سەرەوە هاودژ دەکەنەوە، بەوەی کارەکتەرەکان دێنە دەنگ تا ئەوان بێنە دەنگ. پرۆسەی نووسین دەنگی نووسەر کزترو لاوازتر دەکات، دەنگەکان لەناو شوێندا دەبنەوە لەدایکبوونی فەزا و دنیایەک کە ئێمە نایناسین تەنیا دەنگەکانن لە رێگەی گێڕانەوە بە دنیایەکمان دەناسێنن، دنیایەک ئامادەبوونی دەنگ.. ونبوونی سیماکانی کارەکتەرە، بوونی کارەکتەریش تەنیا لەناو گێڕانەوەکاندا دەیبینین.

لێرەوە ئەوەندە بەس نییە دەنگەکان بگەیەنینەوە یەکتری، بۆ ئەوەی لە چیرۆکێکی فرەدەنگی تێبگەین، هەوڵدان بۆ ناسینی دەنگەکان هیچ نییە جگە لە گەمەیەکی پووچگەرایانە، چونکە ئەوەی سیماکانی دەردەکەوێت خاوەنی دەنگەکان نین، بەڵکو سیماکان لەناو بونیادی دەنگدان، نهێنییەکە لەودیو دەنگەوەیە، هەر لەبەر ئەوەش دەبێ لە کوشتنی ئەشرەف پەیوەندیی منی خوێنەر بە زەمەنی رووداوی تێکست بوەستێنین، ئەو وەستانە گەڕانەوەیە بەرەو یادەوەری بە ئەرشیفکراو و زەمەنی بەجێماو. ئەو نهێنییەی تا کاتی تاوانەکە هەوڵمان نەداوە کەشفی بکەین، بەڵام کوشتنی ئەشرەف هەموو نهێنیەکانمان پێ ئاشکرا دەکات، ئاشکراکردنیش میکانیزمێکی ناو پرۆسەی گێڕانەوەیە، ئەوەش پرسیارکردنی دەنگە لەناو زمان، ئەو دەمەی یەکێک لە کەنیزەکانی کۆشک لە ساتی گێڕانەوەی رووداو سەرزەنشتی داپیرە دەکات، کە لەو کاتەی ئەشرەف کوژرا ئەو لە کوێ بوو «لەنزیک مەیدانی دارە سووتاوەکان یان لە ژووری سەرهەنگی دۆستتدا» لا٨٧

تاوانی کوشتن ئەو بەهایەی نامێنێ، بەقەد ئەوەی پێش کوڕەکانی داپیرە، دەمانەوێ داپیرە خۆی بناسین، ئەو ناسینە هەرگیز پەیوەندیی بە سەپاندنی تاوانباریی سەعیدەوە نییە، هێندەی گەڕانەوەی ئێمەیە بۆ قسەی ئەو کەنیزەیەی کۆشک و پرسیار لە داپیرە دەکات، داپیرەیەک لەناو ئەو حەشاماتی دەنگەدا هەریەکە و بە جۆرێک قسەی بۆ دەکات و چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، ئەوێکی جەرگسووتاو نەبێت بۆ تاکە جارێکیش دەم ناکاتەوە شتێک بڵێت، ئەوێک کە بەخەمی کووشتنی تاقانەی دووەمەوە هیچ نەڵێت چۆن لەو پرسیارەی ئێمە دێتە دەنگ گەر لەگەڵ کەنیزەکان دابنیشین و پێی بڵێین: داپیرە سەرهەنگ کێیە؟ تۆ چۆن سەرهەنگت ناسی؟

ئەو پرسیارە تووشی وەستانێکمان دەکات، بەوەی قسەنەکردنی داپیرە، پەیوەندیی بە منی خوێنەر و دەنگی کارەکتەرەکانەوە هەیە، بەوەی گێڕانەوە ئاشنابوونمانە بە داپیرەوە، ئێمە لە رێگەی دەنگی کارەکتەرەکانەوە ئاشنابوون بەو پەیدا دەکەین، ئەوانن چیرۆکی ڕاکردنی داپیرە بە ئێمە دەگەیەنن، وەک چۆن پرسیاری ناسینی ئەشرەف نهێنییەک نییە تا لێیەوە ڕابمێنین، چونکە لەدایکبوونی ئەشرەف بەندە بە پەیوەندیی داپیرە بە دۆستەکانییەوە: «خەوتنی ڕاگوزەر لەگەڵ عاشقە هەمە جۆرەکانا ئەم منداڵەی خوڵقاند کە شار بە لاقرتی و بە مەحەبەتیشەوە پێیان دەگووت: تاقانەی دووەم»لا٤٧

ئەگەر لەدایکبوون ئاسۆیەکی نوێ بێت بۆ ژیان، ئەوا لەدایکبوونی ئەشرەف یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی



شەڕێکە بۆ سەعید، چونکە ئەو بەرهەمی زەمەنێکە کە دایک بە تاوان تۆماری کردووە، زەمەنێک ئەبێتە کولتوورێک بۆ ئەو، بوونی برایەکی بێ باوکە، برایەک کە بەهۆی پەیوەندیی عاشقەکان بە دایکەوە درووست بووە وای کردووە ڕووبەرووی قەدەری ئابڕووهێنەرانەی لەدایکبوونی براکەی خۆی ببێتەوە: «سەعید بە دووچاوی پڕ لە فرمێسکەوە لەناو دالان و ڕارەو و ژوورەکاندا دەگریا و سەری دەدا بە دیوارەکاندا»لا٨٢

لەدایکبوون سەرەتای مێژوویەکی تاریکە، خود ناتوانێ لێی دەرباز ببێت، تەنیا لە ڕێگەی کوشتنەوە دەتوانێ ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنێت، کوشتن دەبێ بە تاکە چارەسەر بۆ ڕزگاربوون: «وای چەند ئەو شەوی مردنە لەو ڕۆژی لەدایکبوونە دەچوو»لا٨٣.

بە واتای ژیان و مەرگی یەک وێنە بنیات دەنێن، وێنەیەک کە کۆی بوونی ئەو دروست دەکات، بۆیە هاتنەبوونی و کۆتایی هێنانیش بەبوونی هەردووکیان وەک شەرمەزاریی تاوان وێنا دەکرێت، هەر بۆیە ئەگەر سەعید کوشتن بە سڕینەوەی بەرهەمی پەیوەندیی ناسروشتی داپیرە تێبگات، بەو هۆیەوە ئەشرەف دەکوژێت، ئەوا بۆ گەڕانەوەی گوماننەکردن لە ناشەرعیبوونی براکان بە ڕێگەی ئەو دوو پارچە دەستەسڕەیە کە لە بنەماوە یەک دەستەسڕن، ئەوەش بۆ خۆی ئاماژەیەکی ڕوونی پەیوەندیی براکانە بە یەکترییەوە، سەعیدی سوڵتان بەگ لە شەوی نووستنی لەگەڵ یەک لەو کچانەی لەگەڵیدا خەوتووە، پارچەیەکی ئەو دەستەسڕەی پێداوە: «هەندێک خۆی پێسڕی ودەستەسڕەکەی بەردایە سەر سینگم»لا٤٤

ئێمە لە ئاماژەی دەستەسڕەکە بۆ پەیوەندیی براکان دەتوانین ڕووی دووەمی مانامان بۆ دەربکەوێت، بەوەی لەدایکبوونی ئەشرەفیش هەر هەمان وێنەی دەستەسڕەکەی ئەشرەفە، کە دەلالەتی ئەو ئاماژەیەش سووڕانەوەی پەیوەندییەکانە بە دەوری یەکترییەوە، کە لە سەرهەنگ و داپیرەوە دەپەڕێتەوە بۆ سەعیدی سوڵتان بەگ و کەنیزەیەک.

هەڵگرتنی پارچەکەی تری دەستەسڕەکەش لەلایەن داپیرەوە، بۆخۆی گەڕانەوەیەک تری زەمینە، بەوەی سەعید لەناو لەشی خوێناوی ئەشرەف جێی دێڵێت، ئەو جێهێشتنە ئامادەبوونی سەعید لە نێوان سێکس و کوشتندا کۆ دەکاتەوە، بەوەی هەمیشە لە ئامادەبوونی خۆی دەستەسڕ بەکار دێنێت، لێرەوە هێزی ئەو وابەستەبوونە بە خوێن و شەهوەت.

مانەوەی ئەو دەستەسڕە بە پارچەکراوی، مانەوەی مێژووی کوشتنی براکانە، مێژوویەک کە ناسڕدرێتەوە و کەچی زەمەنی خوێنێش ڕێگە نادات بە یەکەوە بلکێنرێتەوە «ئەو دەستە سڕەی لە شەوێکی کارەساتدا دابەش بوویێت، هەرگیز لە ڕۆژێکی ئاسوودەدا نادروێتەوە»لا٤٥

لەگەڵ ئەوەشدا بە تاکە پەیوەندیی ئێمە دەمێنێتەوە، پەیوەندییەک لە ڕێگەی کچ و داپیرە دەیدۆزینەوە، ئەوەش نهێنییەکی ناو شوێنە، کە داپیرە ئەو شوێنەی کردوویەتی بە هەتیوخانە و ئەو منالانەی وەک ئەشرەف بێباوکن، لە خۆیان کۆدەکاتەوە، دواجار هەر ئەوانیش لەناو کۆشکەکەدا تاوانی کوشتنی ئەشرەف بۆ داپیرە دەگێڕنەوە، بۆیە پەیوەندیی داپیرە بە شوێنەوە پەیوەندیی بە نهێنیی زمانەوە هەیە، بەوەی ترس لەو پیاوانەی بێ ژن هەڵناکەن بووەتە هۆی ئەوەی پەنجەرەکان



دابخات، ئەوە گومانە لە هاتنە ژوورەوەی پیاوەکان لە ڕێگەی پەنجەرەوە، کە هاتنیان زەوتکردنی لەشی ئەو هەموو مێینەیە کە ئەو بەڕێوەی دەبات، پارێزگاریکردن لەو دەسەڵاتەی کۆشک بە تەنیا پارێزگاریکردن نییە لە دەسەڵاتی خۆی، بەڵکو پارێزگاریکردنە لە هەڕەمی پێکهاتەی دەسەڵاتێک کە وەک پەیوەندییەکی ئۆرگانی دەرکەوتووە، جۆرێک ڕایەڵەکردنە بۆ پێکهاتەکانی دەسەڵات، ئامادەیی سەعیدی سوڵتان بەگ، ئامادەبوونی دەسەڵات و ژێرخانی ئابووریی کۆشکە، هێزێکە خەون زەوت دەکات، ئیرادەی مرۆڤەکان لەژێر کۆنترۆڵی ئەودایە.

ئەو دەمەی ئەشرەف بە ئەحمەدی ناڵ گەورەی وتووە «تۆ هێناتن» ئەوە گەڕانەوەیە بەرەو ڕابردوو، ئیدراککردنە بەقەدەری خیانەت، پێشبینییەکە لە هاوڕێیەکی گیانی کە یاریکردن و نانخواردن و یەک جۆر خواردن و جگەرە دەکێشن، تاوانی کوشتنیش دەدرێتە پاڵ یەکێکی تر، چونکە گرفتی دەسەڵات ئەوە نییە پیاوکوژان بدۆزێتەوە، بەڵکو گرفتی دەسەڵات ئەوەیە بۆ خەڵکی بسەلمێنێ دەسەڵاتەکەی پتەوە، بۆ ئەوەش دەبێت بێگوناهێک بە تاوانبار ناو ببردرێت، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە بێ گوناهیش بێت، گرنگ ئەوەیە دەسەڵات توانای سزادانی هەیە. وەک لە کەرنەڤاڵی جینۆسایدکردنی ئەشرەفدا دەیبینین، دوای تاوانەکە مناڵە بیبسی فرۆشەکە دەبێتە تاوانبار، ڕەنگە تاکە گوناهی مناڵەکە هەر ئەوە بێت: «گوناهی من چیە، ئەگەر قەدەر منی بۆ بارکردن و داگرتن فرێدابێتە ئەو حەوشە تاریکەوە»ل٦٧

ئەو وێنە کاریکاتێرییەی دەسەڵات وێنەیەکی بەردەوامە کە هەمیشە لە دەرەوەی زەمەن دەژییێت، ئەویش وێنەی گەڕانەوەی حورمەتە لەڕێگەی سۆزانییەکانەوە، بە واتایەکی تر یەکێک لە هۆکاری درووستبوونی ماڵ و خانووە تایبەتییەکانی لەشفرۆشی، هێز و سەرمایەیەکە بۆ ساتەوەختی شکستی دەسەڵات، بۆیە کاتێ نەتوانن مناڵێکیش بێننە ژێر بار، ئەوا دەیانەوێ سۆزانییەکان شەرەفیان بکڕنەوە، مونیرەی تورکی ئەو ئافرەتەی جەستەی کچەکانی لە بەرامبەر کاڵاکان دەگۆڕێتەوە: «کچە بەستەزمانەکانی بەکۆگاکاندا دەگێڕا، جەنابی دوکاندار ئەم شاڵە دەبەم و ئەم کچە عاقڵەت بۆ سەعاتێک لەلا بەجێدەهێلم، زۆر ئەزیەتینەدەیت»ل٧٢

مونیرەی تورکی بەشێکە لەو دەسەڵاتە و سەرمایە ڕەمزییەکەشی لەشی کچەکانییەتی، ئەو درک بەو ڕاستییە دەکات، کە کەناڵەکانی دەسەڵات دەبێت سەرمایەیەکی ڕەمزییان هەبێت بۆ بەڕێوەبردن، پێکهاتەکانی کەناڵەکانی دەسەڵات بۆ یەک نارۆشن نین، بەڵکو کەناڵی ئاشکران، هێندە هەیە میکانیزمەکانی ئەم بەڕێوەبردنە حاڵەتی تایبەت و نهێنیی تایبەتمەندیی خۆی دەبێت، کە وابەستەیە بە کۆی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن، هەر لەبەر ئەوەش توانای ئەوەی هەیە تاوانی کوشتن دابپۆشێت، ئابڕوویەک کە لە پێکهاتەی دەسەڵات رووشا، دەبێت سۆزانییەکان ئەو ئابڕووە هەڵبگرنەوە، سەرهەنگ بەدریش باش لەوە تێدەگات بوونی سۆزانییەکان کاری دەزگە ئایدیۆلۆژییەکانی دەوڵەتە.

بونیادەکانی ناوەوەی دەسەڵات بەردەوام لە پەیوەندییەکی دابەزیوە، ئەوەی پارێزگاری لەو پەیوەندییە دەکات زەبروزەنگی دەسەڵاتە، ئەوەش



وا دەکات بەهاکان بە ئاراستەیەک لە کۆمەڵگە بوونیان نەمێنێت، کە دەبێتە مایەی بێزاری، هاوار لە مناڵە بیبسی فرۆشەکە بکەن، ئەو مناڵەی زۆر لەتەک سەرهەنگ بەدری دەمێنێتەوە و دادەنیشێت، دەبێتە شوێنی گومانی کۆمەڵگە، بەوەی دەیخەنە دووڕریانێکەوە، یا سەرهەنگ بەدری لە مۆزەکەی خۆی دەرخوارد دەدات، یا لە کچەکانی بەشی ئەدات، چونکە کچەکانی شێوەیەکن لە جۆری کچەکانی مونیرەی تورکی، تاوەکو غەریزەی مێینەیی خۆیانی پێ دابمرکێننەوە.
ئەوەش ئاشکراکردنی دەمامکی درۆزنەیی پەیوەندییە ئەخلاقییەکانە، تێگەیشتنە لەو ڕاستییەی کە تەنها بەدڕەوشتی و پەیوەندیی داڕزیو و دەسەڵاتی ڕاگرتووە، دەسەڵاتێک کوشتن و پەیوەندیی ناسروشتی لەسەر وێنا دەکرێت، پەیوەندییەک کە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان نایانەوێت تێکەڵی ببن، وەک چۆن بەوە لەو سێ بەدمەستە ڕازین، کە تێکەڵی کار و پارەکانیان نەبن، ئەو سیانەی کە بەشێوازی خۆیان چیرۆکی کوشتنی ئەشرەف بۆ داپیرە دەگێڕنەوە، ئەوەش بۆ ناسینی کەسایەتیی خۆیانە، نەک بۆ گێڕانەوەی تاوانەکە، لەوەی ئەوان لە خواردنەوە بەرەو فەردانییەتی خۆیان دەچن: «دەستی ئێمە ئەوەندەی بۆ ئەوە کراوە کاغەزی یاری و پیاڵەی شەراب و قاپی عارەق بگرێت، بۆ ئەوە نەکراوە بە پارە و زێڕ و لەشی ئافرەت یاری بکات»لا١٣٠
ئەوەش بەهادابەزینی ئەوانە کە دەسەڵات تەنیا وەک سێ کیسە خۆڵ و خاشاکی ناو بەرمیلەکان دەیانبینێت، ئەوانەش ئەو بونیادانەی دەرەوەی شوێنن، بۆ گێڕانەوە دێنە ناو شوێن و دواجار




پەشیمان دەبنەوە لەوەی ئیدی نابێ لە بەردەم یاساکان ڕاستی بڵێن، چونکە لە بنەماوە ئەوان پێویستیان پێیان نییە، هەر بۆیە حەیدەر باوکی قومارچی و مەستەکان بۆ سەلماندنی ئەو فەلسەفە مناڵکارانەیەی خۆی دەست بە قورئان دانادا بۆ سوێندخواردن، ئەوەش لادانە لە دەستووری ڕیاکاری دەوڵەت: «مەرجنیە حەقیقەت لەبەردەم خوداوە بگەڕێتەوە بەردەمی دادگا»لا٣٤
هاتنی گەردەلوول بۆ ناو کۆشک هاتنی ئەشرەفە لە شێوەی گەردەلوولێک. ئەمجارەیان پەیوەندیی خۆی بەشتە نەجووڵاوەکانی شوێن دەبەستێتەوە، ئەوانەی ئەو پەیوەندییان پێوە دەبەستێ، دەیەوێت

لەگەڵیاندا هێرش بکەنە سەر کۆشکی داپیرە، بۆ تۆڵەکردنەوەی تاوانی کوشتن، ئەوەش گەڕانەوەی ئەشرەفە لەگەڵ پارچە کاغەز و نایلۆنی دڕاو و زەرفی بەتاڵ و گەڵای زەرد، هەریەک لەو ماتریالانە دەلالەتی فەنابوون دەبەخشێت و لە دەرەوەی پەراوێزی ژیاندان، ئەوە ئەشرەفە (گەردەلوول) لەگەڵ خۆی دەیانهێنێتە نێو کۆشک، ئەو گەڕانەوەیەی بەر لە مەرگی ویستی دوا پەیوەندیی بەو شوێنە ڕابگەیەنێت، بەوەی داپیرە لە دواجار فریای بکەوێت و لەناو کۆشک کۆتایی پێ نەیەت، ئەوەش ئینتیمای یادەوەریی ئەوە بۆ شوێن بۆ ئەو کچانەی لەناو کۆشکەکەی داپیرە خۆشیان دەوێت:

«داپیرە.. داپیرە.. مەهێڵە بمکوژن»ل١٩٧

بەفریانەکەوتنی داپیرە وا دەکات ئەمجارە لە ڕێگەی گەردەلوولەوە بێتەوە نێو کۆشک، لەڕێگەی تاقە پەنجەرەی کراوەی داپیرەوە لە ڕێگەی گەڵای زەردەوە کە ئامێزی پێ دەکاتەوە، ئەوەش گەڕانەوەیە بەرەو دایک، بە دوای تاوانی کوشتن کە گەڵای زەرد ئاماژەیە بۆ هەڵوەرینی بوونی لە پایزدا، کە حاڵەتێکی دۆنادۆنی نێوان پایز و ئەشرەفە، کە ئاوێتە بوونی نێوان مرۆڤ و سروشتە، ئاوێتەبوونێک گەڕانەوەیە بۆ ناو سروشت.

شوێن پەیوەندیی کارەکتەرە بە یەکتری، پەیوەندییەک شاردنەوەی نهێنیی ڕووداو وابەستەیە بە کۆشکەوە، بەوەی ئەو پەیوەندییە لە نێوان کوشتن و سێکسکردندا دوالیزمی خۆی دادەمەزرێنێت، ئەوەش وابەستەبوونە بە دەسەڵاتی کۆشک و کارەکتەرەکانییەوە، پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکانی کۆشک و دەرەوەی کۆشکە، بۆیە کیژە پاکیزەکان لە گێڕانەوەدا توانای گێڕانەوەی کۆی زەمەنی ڕووداوەکانیان هەیە، چونکە شوێن ڕووبەری ناسینی مرۆڤەکانە، ئەوەش گەڕانەوەیە بەرەو یادەوەریی کەسێتی، ئەوەش ئینتیماکردنی شوێنە وا دەکات هەریەکە لە قوربانی و جەللاد گیرۆدەی یادەوەری بن، ئەوان نەک خاڵی نین لە یادەوەری، بەڵکو هێزی یادەوەری فرمانیان پێ دەکات.

هەڵبەت لەو کوشتنەشدا دەنگی کیژەکان بە تەنیا نهێنیی تاوانێک ناخەنە ڕوو، هێندەی گەڕانەوەی دەنگ لە ڕێگەی گێڕانەوە ئاماژەیە بۆ کوشتنی هێزێک نەک کوشتنی تاکە کەسێک: «داپیرە.. مەهێڵە بمانکوژن.. داپیرە.. فریامانبکەوە»ل٨٦

لێرەدا ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبینەوە: ئەوانەی بە مەرگی ئەشرەف دەمرن کێن؟ هەڵبەت لێرەدا مردن چەمکێکی مەجازیی هەیە زیاد لەوەی جەستەیی بێت، مردنی ئەشرەف، مردنی خەونی کیژە پاکیزەکانە، مردنی ئەو ئارەزووە ژیاندۆستەی ناو کۆشکە، کە تەواوی کۆشک خەمبار دەکات، هەر یەکەی لە ساتی هەواڵەکە بە شێوەیەک ئازاری پێ دەگات، چونکە لە بنەڕەتدا پێیان وایە ئەشرەف لەناو بنەماکانی شوێن بوونی هەیە، تەنانەت بوونی ئەو لە بوونی ئاویشدا دەبیننەوە، مردنیشی لە لای یەکێک لە کیژەکان دەبێتە مردنی ئاو، بۆیە مردنی ئەشرەف مەرگێکی مەجازییانەی ژیانی کیژەکانی کۆشکە، هاواری ئەشرەفیش بۆ داپیرە بانگەوازێکە بۆ فریاکەوتنی کۆشک تاوەکو ژیانی ناو کۆشک نەمرێت، بە مردنیشی مانای مەجازیی ژیان لە کۆشک کۆتایی دێت.







# شۆڕش و میتاشۆڕش

## له رۆمانی (کەشتیی فریشەکان)ی بەختیار عەلی-دا

ئارام سدیق

### سەرەتا

هونەری گێڕانەوەیە یەکێکە لە هونەرە دێرینەکان و ئەفلاتون دیالۆگی (ئایۆن- Ion)ی تەرخان کردووە بۆ باسکردنی ئەم هونەرە. هاوکات بە پێی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤیش ئەم هونەرە ئاست و شێوازی جۆراوجۆری بەخۆوە بینیوە و گەشەسەندووترین فۆڕمی ئەم هونەرەش رۆمانە. بەپێی رای (د. جەمیل حەمداوی) رۆمان ئامرازێک بووە بۆ ململانێی کۆمەڵایەتی دژی دەستەی دەرەبەگەکان و فریودەران

و رقهەڵگران. هەروەها چەکێکی میللی بووە بۆ تێکۆشان لە دژی چەوساندنەوە و پڕۆتستۆکردنی ئەو واقیعەی کە ئامادەیی هەبووە. واتە لە رۆماندا بە تەنها خود قسە ناکات، بەڵکو کەسانی تریش دێنەگۆ و خودیش لەنێو ئەو دەنگانەی تردا دەنگی خۆی بەیان دەکات. لەبارەی پێگەی رۆمانیشەوە (باختین) رای وایە رۆمان وەکو جۆرێکی ئەدەبیی فۆرم تەواو دەمێنێتەوە و خاوەنی کەماڵێکی تەواوە. رۆمان هونەری گوزارشتکردنی خود و کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆیە و لەم سەردەمە نوێیەدا بە یەکێک لە باڵاترین ژانرە ئەدەبییەکان دادەنرێت و زۆرترین خوێنەریش لە دەوری خۆی کۆکردووەتەوە. (محەمەد رەفیع محمودیان)، سەردەمی نوێ بە سەردەمی خوێنەرانی رۆمان ناو دەبات و پێی وایە لە ئێستادا گەشەکردنەکانی رۆمان لە چاو سەدەیەک پێشووتردا زۆر جیاوازە و گۆڕانکاریی زۆر لە هونەری گێڕانەوەدا رووی داوە و پرسیارەکانی مرۆڤیش لە نێو رۆماندا فراوانتربوون.

ئەگەر رۆمان لە دنیادا بەردەوام لە گەشەکردندا بێت، ئەی رۆمانی کوردی لە کوێی ئەو هاوکێشەی گەشەکردنەدایە. بێگومان لەم ساڵانەی دواییدا هونەری گێڕانەوە بە گشتی و رۆمانی کوردی بەتایبەتی، گەشەی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە و لە ئێستادا ساڵانە چەندین رۆمانی نوێی کوردی چاپ دەکرێت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە، وەک پێویست خوێندنەوە و شیکردنەوە بۆ لایەنە جیاوازەکانی ئەم تێکستانە ناکرێت، کە ئەمە تاڕادەیەک پێگەی رۆمانی کوردی بە لێڵی هێشتووەتەوە. (بێگومان ئەمە باسێکی درێژە و ئێمە لێرەدا دەرفەتی لەسەر وەستانیمان نییە).

ئەوەی ئەم نووسینە دەخوازێت لەسەری بوەستێت رۆمانی (کەشتیی فریشتەکان)ی بەختیار عەلییە. ئەم رۆمانە تا هەنووکە تەنها بەشێکی بڵاوبووەتەوە و من لەم نووسینەدا دەمەوێت توێکاریی چەند چەمکێکی نێو ئەم رۆمانە بکەم، بەتایبەتیش چەمکی شۆڕش، کە وەکو تێمای سەرەکیی تێکستەکە خۆی بەیان دەکات.

## لە بارەی (کەشتیی فریشتەکان)ەوە

کەشتیی فریشتەکان رۆمانێکی قەبارە گەورەی (بەختیار عەلی)یە و لە دووتوێی ٩٠٢ لاپەڕەدا لە چاپ دراوە. رۆمانەکە لە رووی فەزای ئیشکردن و هاوکات گێڕانەوەوە لە کارەکانی پێشووتری رۆماننووس جیاوازە. رۆمانەکە یەک گێڕەرەوەی سەرەکیی هەیە، کە ناوی (وەفای رەفعەت بەگ)ە، کە خۆی پاڵەوانی سەرەکیی رۆمانەکەشە. خاڵی جیاوازی ئەم رۆمانە لەگەڵ رۆمانی (غەزەلنووس و باغەکانی خەیاڵ)دا ئەوەیە، کە ئەم رۆمانە تاکگێڕەرەوەیە، بەڵام لە (غەزەلنووس و باغەکانی خەیاڵ)دا زیاد لە گێڕەرەوەیەک ئامادەیی هەیە. بە گشتی تەواوی رووداوەکانی رۆمانی (کەشتیی فریشتەکان) لە دیدی کەسێکەوە دەگێڕدرێنەوە، کە لە ساڵی ١٩٧٤وە دەچێتە ریزی شۆڕشەوە و سەرەتای دەستبەکاربوونی لە زیندانێکەوە دەست پێدەکات بەناوی (پسمانان).

پاڵەوانی سەرەکیی ئەم رۆمانە (وەفای رەفعەت بەگ) وەکو کەسێک دەردەکەوێت، کە هەموو تروسکەیەکی رزگاریی نەتەوە لە شۆڕشدا دەبینێت و هەموو خەون و خەیاڵێک لەسەر شۆڕش بونیاد دەنێت، زیاتر لە شۆڕشگێڕێکی دۆگماتیک دەچێت




لەم ساڵانەی دواییدا هونەری گێڕانەوە بە گشتی و رۆمانی کوردی بەتایبەتی، گەشەی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە و لە ئێستادا ساڵانە چەندین رۆمانی نوێی کوردی چاپ دەکرێت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە، وەک پێویست خوێندنەوە و شیکردنەوە بۆ لایەنە جیاوازەکانی ئەم تێکستانە ناکرێت، کە ئەمە تاڕادەیەک پێگەی رۆمانی کوردی بە لێڵی هێشتووەتەوە



تا شۆڕشگێڕێکی پرسیارکەر.

خاڵێکی تری جیاواز لەم ڕۆمانەدا ئەوەیە، کە تەواوی ڕۆمانەکە لەنێو ئایدیای شۆڕشدا بە مانا جیاوازەکانییەوە تواوەتەوە، بە جۆرێک کۆی ڕۆمانەکە گەشتێکە بەنێو مێژووی ٣٥ ساڵی رابردووی شۆڕشی نوێی کوردیدا و هەوڵدانە بۆ خستنەڕووی دیوە پەنهان و نەبینراوەکەی شۆڕشی کوردی، ئەو دیوەی تا ئێستا لە چیرۆک و ڕۆمانی کوردیدا نائامادەیە. دیوێک کە چیتر شۆڕشگێڕەکان وەکو سۆپەرمان پیشان نادات و رووی راستەقینەی ئەوان دەخاتە ڕوو. بە گشتی خاڵی جەوهەری ئەم ڕۆمانە لێدانە لە دیوە سۆپەرمانئاساکەی شۆڕشگێڕی کورد و ئەو ئامادەییە سیحرئامێز و سۆپەرمانئاسایەی بە درێژایی هەردوو دەیەی حەفتاکان و هەشتاکان لەنێو چیرۆک و ڕۆمانی کوردیدا هەیبووە. ڕۆمانەکە سودێکی زۆری لە تەکنیکی فلاشباک وەرگرتووە و پێیەکی ڕووداوەکان لە دونیای پێش ڕاپەڕین و پێیەکەی تری لە دونیای پاش ڕاپەڕیندایە.

**ڕۆمانی مێژوویی، یان لە یادەوەرییەوە بۆ ئەدەب**

بە پێی رای لێکۆڵەران ڕۆمانی مێژوویی، هەوڵدانە بۆ نووسینەوە و گێڕانەوەی ئەو لایەن و پنتانەی مێژوو، کە مێژوونووسان پەییان پێ نەبردووە، یان بە ئەنقەست فەرامۆشیان کردووە. زۆرجار ڕۆمانە مێژووییەکان ئەوەندەی حەقیقەتی نێو مێژوو دەنووسنەوە ئەوەندە خەیاڵ نانووسنەوە. ئەگەرچی خەیاڵ ئامادەبوونێکی تەواوی لەنێو ڕۆمانی مێژووییدا هەیە و شوێنبزر نییە، بەڵام ڕۆماننووس لە ڕۆمانی مێژووییدا زۆرجار لە مێژوونووسەکان راستگۆترە بۆ خستنەڕووی دیوە تاریکەکانی نێو مێژوو.

یەکێکی تر لەو خاڵانەی زۆرجار دەبەسترێتەوە بە ڕۆمانی مێژووییەوە یادەوەرییە، کە زۆرجار ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا لە ڕۆمانی مێژووییدا ڕۆماننووس یادەوەریی خۆی دەگێڕێتەوە یان نا؟ ئەگەر ئەوەی دەیگێڕێتەوە یادەوەری نییە چییە؟ بەو پێیەی هەر ڕۆماننووسە بە شێوازێکی تایبەت بە خۆی کار دەکات، هاوکات ڕەنگە هەر ڕۆمانە و بەشێوەیەکی تایبەتیش کاری لەسەر کرابێت. بەڵام «لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە بنجوبنەوانی ڕۆمان سەلمێنەری ئەو راستییەن، کە ڕۆمان وەکو جۆرێکی ئەدەبیی نوێ پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ نووسینەوەی ژیاننامە و بیرەوەریدا هەیە. بە واتایەکی تر ڕۆمان ئەوەندەی بریتییە لە خەیاڵ، ئەوەندەش جێپێی بەسەرهات و سەربووردە و گەشتی ژیانی تێدا دەبینرێت». بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەکی زۆر لە نێوان نووسینەوەی ژیاننامە و ڕۆماندا هەیە. لە ڕۆماندا نووسەر هەرگیز پابەندی سەد لە سەدی واقیع نابێت و ڕەنگە لە زۆر شوێندا جڵەوی خەیاڵ تا ئاستی خولقاندنی ئەفسانەش بەربدات، بەڵام لە نووسینەوەی ژیاننامەدا نووسەر پەیوەستییەکی تەواوی بە واقیعەوە هەیە. ئەگەرچی ڕەنگە بەشێک لەو واقیعە بە جۆرێک لە جۆرەکان فەرامۆش بکرێت بەهۆی ئەوەی ڕەنگە (نووسەر/گێڕەرەوە)کەی حەز بە وەبیرهێنانەوەی نەکات، بەڵام بە گشتی ژیاننامە پەیوەستییەکی تەواوی بە واقیعەوە هەیە. هاوکات جۆرێک لە ژیاننامە هەیە، کە ئەگەرچی واقیعیانە گێڕدراوەتەوە و خەیاڵ ئامادەیی نییە، بەڵام بە سوودوەرگرتن لە تەکنیکەکانی ڕۆمان و هونەری گێڕانەوە فۆڕمی ڕۆمانی وەرگرتووە، کە دەتوانین

وەکو د. هاشم ئەحمەدزادە ئاماژە بە رۆمانی هەیئەی (سەلام عەبدوڵڵا) بدەین، کە لەم شێوەیەیە، بەڵام لێرەدا پرسیارێکی تر سەرهەڵدەدات کە ئایا تەوزیفکردنی واقیع لەنێو رۆماندا تێکستێک دەکاتە رۆمانێکی مێژوویی؟ بەو پێیەی هەر تێکستێک خاوەنی یەکەیەکی سەربەخۆیە و ناکرێت کۆمەڵێک پێوەر و قاڵبی نەگۆڕ دابنێین و تێکستەکان لە نێویاندا جێ بکەینەوە، یان بە زۆر بیانخەینە نێو ئەو پێوەرانەوە، بەڵام بە رای بەشێک لە لێکۆڵەران «رۆمان هونەرێکە تایبەت بە سەردەمی نوێ و واقیعگەرایی یەکێکە لە هۆگرییەکانی ئەم چاخە نوێیەی رۆمان». ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بزانین (کەشتی فریشتەکان) سەر بە کام نەسلی رۆمانە؟ ئایا رۆمانێکی مێژووییە؟ یان توانەوەی یادەوەرییە لە ئەدەبدا، یان بەختیار هەوڵی نووسینەوەی ژیاننامەی کەسێکی دیاریکراوی داوە؟

کەشتیی فریشتەکان لەو رۆمانانەیە، کە زیادەڕەوی نییە بڵێین ئاوی لە هەموو سەرچاوەکان خواردووەتەوە بۆ ئەوەی پێکهاتەی خۆی بونیاد بنێت. هاوکات دەتوانین وەکو رۆمانێکی مێژوویی لێی بڕوانین، یان بە رۆمانێکی واقیعگەرایی سەیری بکەین، بەڵام ئەوەی هێڵی مێژوویی ئەم رۆمانە کاڵ دەکاتەوە، ئەو جڵەوبەردانەی خەیاڵە تا دواسنوور. بەجۆرێک واقیع و خەیاڵ تا دوائاست تێکەڵ دەبن، بەڵام بە شێوەیەک کە هەردووکیان خزمەت بە بونیادی تێکستەکە دەکەن. واتە ئەگەرچی (کەشتی فریشتەکان) وەکو رۆمانێکی مێژوویی دێتە بەرچاو، هاوکات رۆمانێکە وەکو جۆرێک لە یادەوەرییش دەخوێنرێتەوە، یادەوەرییەک کە بە فۆرمێکی بەرزی هونەری نووسرابێتەوە.

## شۆڕش چییە؟

چەمکی (شۆڕش) لەو چەمکانەیە کە تەفسیر و لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت و لە ریزی ئەو چەمکانەدایە، کە خاوەنی ئاڵۆزییەکی زۆرە. کارل پۆپەر لای وایە وشەی (شۆڕش) دەشێ بە مانای گۆڕانێکی ئاشتیخوازانە بێت و هەروەها دەشێ بە مانای گۆڕانێکی توندوتیژانە بێت و پێیوایە مارکسیزم هەردوو ماناکەی بە کراوەیی هێشتووەتەوە. هەروەها (پۆپەر) ئەوەش دەخاتە ڕوو، کە گۆڕانی توندوتیژانە بە زۆری ئەنجامەکەی بە دیکتاتۆری دەشکێتەوە و نموونەی شۆڕشی سەدەی حەڤدەیەم لە بەریتانیا دەهێنێتەوە، کە دیکتاتۆرییەتی (کرۆموێل)ی لێکەوتەوە و هەروەها شۆڕشی فەرەنسی، کە دیکتاتۆری رۆبسپێر و ناپلیۆنی لێ کەوتەوە و شۆڕشی رووسیاش، کە دیکتاتۆرییەتی ستالینی بەرهەم هێنا.

هاوکات عەزمی بەشارە لە پێناسەی شۆڕشدا دەنووسێت: مەبەست لە شۆڕش بریتییە لە جووڵانەوەیەکی جەماوەریی بەرفراوان لە دەرەوەی ئەو بونیادە دەستوورییەی کە هەیە، یاخود لە دەرەوەی ڕەوایەتی، کە ئامانجی خۆی لە گۆڕینی سیستمی حوکمداریی لە دەوڵەتدا دەبینێتەوە. بەم مانایە شۆڕش بریتییە لە جوڵانەوەیەک بۆ گۆڕان لە ڕەوایەتیی سیاسی، کە ددانی پێدا نانێت و دەیگۆڕێت بە ڕەوایەتییەکی نوێ. هەمان نووسەر ئەوەش دەخاتە ڕوو، کە شۆڕش بەم مانا دیار و بەرجەستەیەیەوە دیاردەیەکی رادیکاڵی هاوچەرخە، کە لەسەر نوێکردنەوە و نوێخوازی راوەستاوە، هەروەها بە دوای نوێخوازیدا وێڵە و خۆیشی وەک نوێکارێک لە قەڵەم دەدات. ئەوەش بە پێچەوانەی





ئەوەی فەیلەسووفە یۆنانییەکان ناویان نابوو شۆڕشەکان. لای ئەوان شۆڕشەکان بەرجەستەی خولێکی چەندبارەبووەوەی گۆڕینی سیستمەکانە، تەنانەت ئەوکاتەشی شۆڕشەکان دەبنە هۆی گۆڕینی سیستم، ئەوا لەم دۆخەدا جوڵانەوەیەکی بازنەیی لە هەڵکشانی سیستمێک و دواتر داکشانی پێک دەهێنێت، بێ ئەوەی هیچ شتێکی نوێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بێنێتە کایەوە.

ئەوەی پرسیاری سەرەکییە لێرەدا ئەوەیە، کە جۆرەکانی شۆڕش کامانەن؟ ئایا مرۆڤ پێویستی تەنها بەو شۆڕشانەیە کە لە پێناو (ئەوانی تر)دا دەیکات، یان پێویستە بەر لەوەی بیر لە شۆڕش بۆ ئەوانی تر بکاتەوە، شۆڕشێکی خودیشی پێویستە. ئەوەی لە سەرەوە خرایە ڕوو، تەنها ئەوەیە کە مرۆڤ بیر لە گۆڕینی سیستمێک بە سیستمێکی تر دەکاتەوە. واتە لێرەدا شۆڕش وەکو کردەیەکی دەستەجەمعی خۆی دەنوێنێت، بەڵام چەمکی شۆڕش تەنها لەمەدا کورت نابێتەوە. بە دیوە فەلسەفیەکەیدا مرۆڤ بەرلەوەی بیر لەوە بکاتەوە دونیا بگۆڕێت پێویستە هەوڵی گۆڕینی خۆی بدات و شۆڕشێک بەسەر دیوە تاریکەکەی خۆیدا بکات.

بەختیار عەلی لەم ڕۆمانەدا لە چەند شوێنێکدا ئاماژەی بەوە داوە، کە ئینسان پێویستی بەوەیە شۆڕش بەسەر خۆیدا بکات، دواتر لە بیری ئازادکردنی ئەوانی تردا بێت. لە لاپەڕە ٧٢٠دا دەڵێت: «هیچ شۆڕشێکی ڕەوا لەسەر زەوی نییە، ئەو شۆڕشە نەبێت، کە سەرەتا مرۆڤ بەسەر خۆیدا دەیکات». بەختیار لە لاپەڕەی دواتردا دەڵێت: شۆڕش یاخیبوونی دیوە باشەکەی ئینسانە بەسەر دیوە چەپەڵ و زۆردارەکەیدا. هاوکات لە شوێنێکی




تردا دەنووسێت: تەنیا شۆڕشی ڕاستەقینە لە دونیادا ئەو شۆڕشەیە ئینسان دژی ئازار دەیکات. لێرەدا پرسیاری ئەوە سەرهەڵدەدات مرۆڤ شۆڕش لە پێناو چیدا دەکات؟ ئایا بۆ ئەوەیە بەسەر لاشەی ئەوانی تردا بڕوات، بۆ ئەوەی بەختەوەری چنگ بخات، یان شۆڕش بۆ ئەوەیە ئازاری مرۆڤەکان کەمتر و کەمتر بێتەوە؟ بێگومان ئەزموونەکانی پێشووتر ئەوەیان سەلماندووە، کە هیچ کام لەو شۆڕشانەی

خوێن دەرێژن و ئازار بەرهەمدێنن، ناتوانن شۆڕشێک بن بۆ حەسانەوەی مرۆڤ، بەڵکو دووبارەکردنەوەی هەمان ئەزموونە تاریکەکانی دەسەڵاتی پێشووترە بە دیوێکی دیکەدا. هەر بۆیە بەختیار لەم ڕۆمانەدا بڕوای وایە کە کەسی شۆڕشگێر دەبێت کەسێک بێت ئازار کەم بکاتەوە، نەک ئازاری تر بخولقێنێت. هاوکات چەمکی شۆڕش لەم ڕۆمانەدا چەمکێکی خودییە، ئەمەش بەو مانایەی شۆڕشەکان دەبێت سەرەتا مرۆڤ بەسەر خۆیدا بیکات، تا مرۆڤێکی لیبراڵ بەرهەم نەیەت خەونیش بە کۆمەڵگە و سیستمی لیبراڵەوە نابینرێت. بە گشتی (کەشتیی فریشتەکان) هەوڵێکە بۆ ڕاگرتنی مرۆڤی کورد لە بەردەم چەمکی شۆڕشدا و ڕووبەڕووکردنەوەی پرسیاری شۆڕش بۆچی و لە پێناو چیدایە؟ شۆڕشەکانی سەدەی ڕابردووی ئینسانی کورد، لە پێناوی چیدا بوون و بۆچی بوون؟ لەم پرسیارانەوە ڕۆماننووس خوێنەر ئاوێتەی نێو کاراکتەرەکانی ڕۆمانەکە دەکات.

## توێکاریی شۆڕشگێڕ

لەگەڵ ئەوەی هەموو شۆڕشێک جۆرێکە لە وشیاربوونەوە بەرامبەر سیستمێک، کە ڕەنگە دیکتاتۆری بێت، یان سیستمێک بێت دژی زۆرینەی کۆمەڵگەیەک بێت. بۆیە لە ڕێی سەرهەڵدانی تاکی وشیارەوە شۆڕشەکان دروست دەبن، بەڵام ئایا هەموو کەسەکانی نێو شۆڕشەکان کەسانی وشیارن؟ بێگومان چۆن کۆمەڵگە لە هەموو چین و توێژە جۆربەجۆرەکان پێکهاتووە و کەسانی هێمن و مرۆڤدۆستی تێدایە، تا دەگاتە کەسانی پیاوکوژ، بەهەمان شێوەش شۆڕش پێکهاتەیەکی بچووک

کراوەی کۆمەڵگەیە، بۆیە لە هەموو جۆرە مرۆڤێکی تێدا جێبووەتەوە، بەڵام دەکرێت بپرسین پەیامی شۆڕش چییە؟ ئایا پەیامەکەی بۆ خوێنرێژییە و ئەوەی وەکو (شۆڕشگێڕان) بیری نەکردەوە، بۆ کوشتنە یان چی تر. بێگومان هەموو شۆڕشەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان بەرهەمهێنەری توندوتیژین، بەڵام کاتێک خوێنرێژی دەبێتە پەیامی سەرەکیی شۆڕشێک و هەموو ئاسۆیەکی ئازادی و ڕزگاربوون لەوێوە دەبینێت، ئیتر لێرەدا بەربەرییەت دروست دەبێت و شۆڕشگێڕ جگە لە کەسێکی بەربەری هیچی تر نییە.

بەختیار لە لاپەڕە ٥٢ی ڕۆمانەکەدا بە ڕستەیەکی ترسناک تەفسیری کەسی شۆڕشگێڕ دەکات و دەنووسێت: «شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە دەکوژێت بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئازار نەچێژێت، بۆ ئەوەی لە ڕیزی بەهێزەکاندا بێت، لە بەری براوەکاندا..»

ئایا بۆ ئەوەی مرۆڤ براوەبێت دەبێت بکوژبێت؟ بێگومان نەخێر، بەڵام ئەمە توێکاریکردنی فیکری شۆڕشگێڕە کوردەکانە، کە ساڵانێک مرۆڤی کورد خەونی لەسەر بوونی ئەوان هەڵدەچنی و چاوەڕوان بوون مێژوویان لە دیکتاتۆرییەتەوە بۆ بگۆڕێت بە دیموکراسی، بەڵام ئایا ئەو (شۆڕشگێڕ)انە ئەو ڕۆڵەیان بینی؟ بەختیار لە شوێنێکی تردا لەبارەی وەزیفەی شۆڕشگێڕەوە دەنووسێت: «شۆڕشگێڕ ئەوە نییە، کە مێژوو دەگۆڕێت، بەڵکو ئەوەیە کە کۆمەک بە مرۆڤ دەکات نەبێتە جانەوەر، لەوە زیاتر هیچی تر نییە. گرنگ ئەوەیە کاتێک مرۆڤ بۆ ئازادی شەڕ دەکات نەبێتە جانەوەر، ئەوە تەنیا پرسیاری گرنگی مێژووە.»



لە کەشتیی فریشتەکاندا فۆڕمێکی شۆڕشگێڕ پیشان دەدرێت، کە فۆڕمێکە ئارادەیەک لە هەموو شۆڕشەکاندا و لە هەموو سوچێکی دنیادا دەبینرێنەوە، ئەویش ئەو فۆڕمەی شۆڕشگێڕە، کە لە پێناو شتە تایبەتییەکانی خۆیاندا دەجەنگن و شۆڕش دەکەنە پردێک بۆ گەیشتن بەو شتە تایبەتییانە



ئەگەر شۆڕشگێڕەکان خەونی گۆڕینی مێژوویان نەبووە، ئەوان خەونی بە جانەوەرنەبوونی ئینسانی کوردیان هەبووە. واتە شۆڕش بە جۆرێک لە جۆرەکان رزگارکردنی مرۆڤی کورد بووە لە دەعەجانبوون. شۆڕشگێڕەکان ئەو زاهیدانە بوون مرۆڤی کوردیان لە لێواری دەعەجانبووندا گێڕایەوە بۆ مرۆڤبوون، یان بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین شۆڕش فریادڕەسێکە لەو دۆخەی کە جۆرج ئۆروێل لە رۆمانی ١٩٨٤دا ئاماژەی بۆ دەکات، کە دۆخێکی پۆلیسییە و مرۆڤ لە سیستمی تۆتالیتاریدا بوونی بە تەواوی کۆنترۆڵ دەکرێت و خاوەنی هیچ جووڵەیەکی خۆی نابێت.

لە کەشتیی فریشتەکاندا فۆرمێکی شۆڕشگێڕ پیشان دەدرێت، کە فۆرمێکە تاڕادەیەک لە هەموو شۆڕشەکاندا و لە هەموو سوچێکی دنیادا دەبینرێنەوە، ئەویش ئەو فۆرمەی شۆڕشگێڕە، کە لە پێناو شتە تایبەتییەکانی خۆیاندا دەجەنگن و شۆڕش دەکەنە پردێک بۆ گەیشتن بەو شتە تایبەتییانە. بەختیار ئەم جۆرە لە شۆڕشگێڕی لەم چەند رستەیەدا کورت کردووەتەوە: «خەڵکان ناچنە شۆڕشەوە بۆ ئەوەی هیچ چاک بکەن، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەو شتانە حەڵاڵ بکەن کە لەکاتی تردا حەڵاڵ نین»، یان لە شوێنێکی تردا دەنووسێت: «لە شۆڕشدا دەتوانیت هەموو ئەو یاسا ئەخلاقیانە بشکێنێت، کە دەیەوێت. شۆڕش هیچ نییە جگە لە گۆڕستانێکی گەورەی ئەخلاق».

بۆ ئەوەی شۆڕش بەرەو بەربەرییەت هەنگاو نەنێت، پێویستی بە رەچاوکردنی عەدالەت و هاوکات ئەوەیە سیستمێکی رێکخستنی نێوخۆیی هەبێت. لە کەشتیی فریشتەکاندا جۆرێک لە فەوزای نێو شۆڕش خراوەتەڕوو، کە زیاتر پیشاندانی دیوە بەربەرییەکەی شۆڕشە بە جۆرێک خودی شۆڕش لە هەندێ کاتدا بووەتە هۆی ئەوەی سووکایەتی بە شۆڕشگێڕەکان بکات و گرتووخانەیان بۆ دابمەزرێنێت، هەر بۆیە بەختیار لە زاری یەکێک لە کاراکتەرەکانەوە دەڵێت: «شۆڕشێک سووکایەتی بە شۆڕشگێڕکانی بکات، کە خۆی گرتووخانەی ترسناک دابمەزرێنێت، کە رەچاوی عەدالەت نەکات، شۆڕشێکە ناگاتە ئامانج».

ئەگەرچی هەموو شۆڕشەکان لە درووشمدا هەڵگری هەستی ئینساندۆستی و پاراستنی بەرژەوەندیی سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگەن، بەڵام بەشی هەرە زۆری شۆڕشەکان ئەزموونکردنی جۆرێک لە بەربەرییەتن، بە حەڵاڵکردنی خوێنی سەرجەم مرۆڤەکانی تر، کە وەک ئەوان بیر ناکەنەوەو لە دەرەوەی ئەوان دەیانەوێت بژین.

## شۆڕش و جێندەر

لەم بەشەدا دەمەوێت ئەو تێڕوانینە جیایە بخەمە ڕوو، کە لە نێوان هەردوو رەگەزدا لەمەڕ چەمکی شۆڕشەوە هەیە، بەجۆرێک لای بەختیار رووبەڕووی دوو ڕوانینی جیاواز دەبینەوە بۆ شۆڕش. روانینێک شۆڕشگێڕە نێرەکان شۆڕش بۆ رزگاری هەموان دەکەن، لە لایەکی ترەوە، رەگەزەکەی تر بە شێوەیەک لە شێوەکان کۆیلەی نەریتەکانی ئەو کۆمەڵگەیەیە، یان دەستی نێرەکانیەتی و دەیەوێت لە پێناو خۆیدا و بۆ ئازادکردنی خودی خۆی (مەبەست رەگەزی مێینەیە) شۆڕشێکی تر بکات.

لە سەرەتای ئەم نووسینەدا ئەو تێڕوانینەمان خستە ڕوو، کە مرۆڤ بەرلەوەی پێویستی بەوە

بێت شۆڕش بۆ ئەوانی تر بکات، پێویستی بەوەیە شۆڕشێکی ناوەکی لەگەڵ خودی خۆیدا بکات. واتە لێرەدا دوو جۆر شۆڕش سەرهەڵدەدەن. جۆری یەکەم شۆڕشێکە لە پێناو کۆمەڵگەدا و پەیامێکی دەستەجەمعی بەسەریدا زاڵە. جۆری دووەمیش ئەو شۆڕشەیە ئینسان لە پێناو ئازادکردنی عەقڵی خۆیدا دەیکات و خودی خۆی رزگار دەکات و شۆڕشێکی ناوەکییە و تاکەکان لەگەڵ خودی خۆیاندا دەیکەن. بەڵام لێرەدا جۆرێکی تری شۆڕش سەرهەڵدەدات، کە من بە جۆری سێیەمی شۆڕش و بە شۆڕش جێندەری ناوی دەبەم، کە بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگە رۆژهەڵاتییەکان پێویستیان بەم شۆڕشەیە، کە تاکی مێینە بۆ ئازادکردنی جەستە و عەقڵی پێویستی بە شۆڕشێک هەیە. فیگۆری (نەغەدەی ماردینی) کە وەکو دەنگێکی مێینەی نێو رۆمانەکە کاریگەریی لەسەر رووداوەکان هەیە، لای وایە شۆڕش هیچ نییە جگە لە تەعبیرێکی دەستەجەمعی پیاوان لە پیاوەتیی خۆیان.

ئەم رستەیەی نەغەدە بۆنی ئەوەی لێدێت کە هیچ کام لە شۆڕشەکان لە پێناو هەردوو رەگەزەکەدا نەبوون و تەنها رەگەزێک سودمەندی سەرەتا و کۆتایی بووە و رەگەزەکەی تر، کە مێینەیە لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا بووە. ئەگەرچی زۆر جاران ئەم رەگەزە لەنێو شۆڕشدا بەشداری کردووە و ئامادەیی فیزیکی و عەقڵی هەبووە، بەڵام لە بەرهەمەکەی سوودمەند نەبووە. هەر لە زمانی (نەغەدە)وە بەختیار عەلی لە لاپەڕە ٥٦٤دا دەڵێت: «شۆڕش بۆ ژن مانایەکی تری هەیە. شۆڕش لای ئێوە (مەبەست لە پیاوانە) ئەوەیە ببن بە خاوەنی دونیا، بەڵام لای من ئەوەیە ببم بە خاوەنی جەستەی خۆم».




ئەگەرچی بەختیار لەم رۆمانەدا هەوڵی نووسینەوەی مێژووی شۆڕشی نوێی کوردی دەدات، بەڵام لەم رستەیەوە ئەو ئاماژەیە فرێدەدات، کە ئێمە لەگەڵ ئەم شۆڕشەدا شۆڕشێکی ترمان پێویستە، کە بۆ رزگارکردنی رەگەزی مێینەیە لە نێو کۆمەڵگەی کوردیدا، لەو کۆتوبەندانەی کولتووری کوردی لەبەردەمیاندا دروستی کردووە و هاوکات بوونەتە رەگەزێک، کە خاوەنی جەستەی خۆی نەبێت. لێرەوە خاڵێکی لاواز و پڕکەموکوڕی شۆڕشی کوردی دەردەکەوێت، کە پەراوێزخستنی رەگەزی مێینەیە، کە ئەمەش زیاتر لە (میتاشۆڕش)ی نزیک دەخاتەوە.

## لە نێوان شۆڕش و میتاشۆڕشدا

سەرەتا پێویستە بزانین ئەوەی شۆڕش لە میتاشۆڕش جیادەکاتەوە، زۆریی بەشداربوونی هاووڵاتییانە، یان بوونی بنەمای فیکری و فرەڕەهەندیی شۆڕشەکەیە؟ ئەگەر نموونەی شۆڕش فەرەنسی وەربگرین دەبینین ئەم شۆڕشە بەر لە هەر شتێک بنەمایەکی فیکری هەبووە و نوسەرێکی وەکو جان جاک رۆسۆ بە نووسینەکانی هەوێنی دروستکردنی شۆڕشەکە بوو و یەکێک بووە لە ئیلهامبەخشەکانی شۆڕشی فەرەنسی و لە وتارە بەناوبانگەکەیدا دەربارەی سەرچاوەی زوڵم و نایەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا، تەواوی ئەو بۆچوونە کۆنانە لەبەریەکهەڵوەشاندەوە، کە پاساو بۆ دەستکەوت و جیاوازیی چینایەتی دەهێننەوە و رەوایەتییان پێدەبەخشن. ئەم وتارەی رۆسۆ بە راگەیاندنی شۆڕش دەچوو لە دژی رژێمی



دەسەڵاتدار و دەستکەوتە تایبەتییەکانی چینە دەسترۆیشتووەکان. ئەمەش سی ساڵێک بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی فەڕەنسی بوو، بۆیە خاوەن بەرژەوەندییەکان دژی رۆسۆ وەستانەوە.

کەواتە ئەوە فەیلەسووفەکان بوون زەمینەسازییان کرد بە بەرهەمە فیکرییەکانیان و توانیان شۆڕش بەرپا بکەن. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ شۆڕش لە عەدەمەوە دروست نەبووە. ئەگەر فەیلەسووفانی رۆشنگەر نەبوونایە، سستمی کۆن هەرەسی نەدەهێنا و دنیای تازە دروست نەدەبوو، کە گرنگترین شتی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتیبوونە.

بە پێی رای لێکۆڵەران چەمکی شۆڕش لە بەرامبەر جوڵانەوەی کرۆموێلدا (١٥٩٩-١٦٥٨) بەکار نەهێنرا، کە لە ساڵی ١٦٤٩ بووە مایەی هەڵواسینی (شارلی یەکەم). بەم مانایە چەمکی شۆڕش بە مانای گێڕانەوە، یاخود بەدەستخستنەوە دێت، بۆ خاوەنە پێشینەکانی، یان سروشتییەکانی. هاوکات هەندێک لە لێکۆڵەرانی نوێش لایانوایە شۆڕش لەم سەردەمە نوێیەدا بە نوێبوونەوە و دابڕان لە رەوتی گەشەکردنە مێژوویەکەیەوە پەیوەستە. ئەمە ئەو دابڕانەیە، کە مژدەی هێنانی شتێکی نوێی پێیە.

لینین لە وتارێکدا بەناوی (داڕووخانی ئینتەرناسیۆنالی دووەم) دەڵێت: شۆڕش بێ بوونی حاڵەتی شۆڕشگێڕی مومکین نییە، بەڵام هەموو حاڵەتێکی شۆڕشگێڕی نابێتە مایەی شۆڕش.

بە گشتی دەتوانین بڵێین چەمکی شۆڕش بەو شۆڕشانە دەوترێت کە بنەمای فیکرییان هەیە و لینین گوتەنی هەموو جوڵانەوە و ناڕەزایەتییەک بە شۆڕش ئەژمار ناکرێت. هاوکات شۆڕش تەنها هەڵچوونی کۆمەڵێک مرۆڤ نین دژی ناعەدالەتیی سیاسی و دەسەڵاتێکی دیاریکراوە، بەڵام هەموو ئەو شۆڕشانەی بنەمای فیکرییان نییە، یان لاوازە و فرە رەهەند نییە و هەڵچوونی کۆمەڵێک ئینسانە دژی سیستمێک و دەسەڵاتێکی سیاسی و هەمەلایەن نییە، دەکرێت بەم جۆرە لە شۆڕش بوترێت (میتاشۆڕش)، کەواتە دەتوانین بڵێین میتاشۆڕش چەند پلەیەک لە خوار شۆڕشەوەیە و فۆرمێکی شۆڕشە، کە بێ ئاراستە و بێ فیکر و بێ دیاریکردنی ئایندەیە. واتە فۆڕمی سەرەتایی شۆڕش میتاشۆڕشە.

دەکرێت لێرەدا ئەو پرسیارە بکەین، شۆڕشی کوردی هەڵگری کام سیفەتەیە؟ ئایا شۆڕشێکە لە چەشنی شۆڕش فەڕەنسی، یان شۆڕشێکە لە هەڵچوونی ئینسانەکانەوە بەرجەستە بووە؟ بێگومان بە پێی ئەو ئاماژانەی لە رۆمانەکەی بەختیاردا هەیە زیاتر چەمکی (میتاشۆڕش) لە شۆڕشی کوردیدا رەنگدانەوەی هەبووە. بەو پێیەی شۆڕشێک نەبووە فرەڕەهەند و بنەمایەکی تۆکمەی فیکریشی نەبووە و هاوکات رەگەزی مێینەی بەتەواوی خستبووە پەراوێزەوە، بۆیە ئەم خاڵانە وەکو نەنگیی شۆڕشی کوردی دەبینرێن. لە خوێندنەوەی رۆمانی (کەشتیی فریشتەکان)یشدا بە تەواوی چەمکی (میتاشۆڕش) لای خوێنەر گەڵاڵە دەبێت. بۆیە دەکرێت بە کورتی بڵێین ئێمە خاوەنی شۆڕش نەبووین، ئەوەی بە ناوی شۆڕشەوە سەدەیەکە کورد سەرقاڵیەتی، بێجگە لە (میتاشۆڕش) هیچی تر نییە، هەر بۆیە تا ئێستاش ئایندەی بە نادیاری ماوەتەوە. هەروەها هەموو ئەو شۆڕشانەی، کە قۆناغی بونیادنانی کۆمەڵایەتی و دانانی بناغەیەکی تۆکمەی سیاسی و ئابووری و کولتووری لە پشتەوە نییە، بە نیوەناچڵ

ئەژمار دەکرێن و دەکرێت هاوشێوەی ئەم جۆرە لە فۆرمی شۆڕشەکانی کورددا ببینینەوە و لە فۆرمە تیۆرییەکەیدا زاراوەی (میتاشۆڕش) بە سەریان دەبرێت، چونکە هیچ شۆڕشێک بە تەنها بە جووڵانەوەی چەکداری ناگاتە کەماڵ.

## بەر لە کۆتایی

بەرلەوەی دواخاڵێک بۆ ئەم نووسینە دابنێم، دەمەوێت لە چەند خاڵێکدا کۆی سەرنجەکانم لەسەر ئەم ڕۆمانە کۆ بکەمەوە و وەکو ئەنجامگیرییەک بۆ ئەم نووسینە بیخەمە ڕوو و کۆی ئەو خاڵانەش ئەمانەن:

١-ئەگەرچی کەشتیی فریشتەکان بە تەواوی وەک ڕۆمانێکی مێژوویی ئەژمار ناکرێت، بەڵام لە ریزی ئەو ڕۆمانانەیە کە زیاتر گوزارشتە لە ڕۆحی دەستەجەمعیی کۆمەڵگەی ئێمە، هەر ئەم خاڵەشە لە ڕۆمانی مێژوویی نزیکی دەخاتەوە.

٢-خاڵێکی تر کە ئەم ڕۆمانە بونیادی دەنێتەوە، ئەو تێکچوونەی پەیوەندیی ئەدەب و مێژووە لە نێو ئەدەبی کوردیدا. ئەم ڕۆمانە دەکرێت وەکو یەکێک لە هەوڵە جوان و سەرکەوتووەکان وێنا بکەین، بەو پێیەی نووسەر توانیویەتی هاوسەنگیی نێوان فەنتازیا و واقیع رابگرێت و خوێنەر هەست بەوە نەکات ڕووداوەکان لە دەرەوەی مێژوو ڕوودەدەن.

٣-تێکشکاندنی پاڵەوانی سۆپەرمانئاسا، کە لەم ڕۆمانەدا بە شێوەیەکی جوان کاری لەسەر کراوە و ئەو وێنە دووبارە و باوەی شۆڕشگێڕی سۆپەرمانئاسای لە نێو دەقی گێڕانەوەیی کوردیدا تێکشکاند و وێنەیەکی راستەقینە و نوێی بونیاد نا.

٤-بەرنەشتەرخستنی شۆڕشی نوێی کوردی لەم ڕۆمانەدا خاڵێکی جەوهەری بوو، کە لە ڕۆمانەکانی پێش ئەم ڕۆمانەدا بەم شێوە فرەڕەهەندە و بەم بێپەردەییە شۆڕش نەخراوەتە بەر ڕەخنەی هەمەلایەنە.

٥-خاڵی هەرە لاوازی ئەم تێکستە درێژنووسی و درێژکردنەوەی هەندێک بەشی ڕۆمانەکەیە، کە لە پێویستی تێکستەکە زیاتر درێژکراوەتەوە و بەتایبەت خودی ئەو بەشەی ناوی (کەشتیی فریشتەکان)ە. زۆرجار ئەم درێژکردنەوەیە بە زیانی بونیادی گشتیی ڕۆمانەکە شکاوەتەوە.




**سەرچاوەکان:**

-بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، ڕۆمان، لە بڵاوکراوەکانی ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی ٢٠١٢.
-محەمەد ڕەفیع محمودیان، نضریە رمان، نشر فرزان، چاپ اول ١٣٨٢.
-ناسر ایرانی، هنر رمان، نشر ابنگاه، چاپ اول بهار ١٣٨٠
-د. هاشم ئەحمەدزادە، زمان، ئەدەب و ناسنامە، لە بڵاوکراوەکانی کتێبی ئەرزان، چاپی یەکەم سوید ٢٠١١.
-عزمی بشارە، شۆڕشناسی، وەرگێڕانی: د. یاسین سەردەشتی و بەرزانی مەلا تەها، لە بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕان ٢٠١٢.
-هاشم ساڵح، لە شۆڕشی فەرەنسییەوە بۆ شۆڕشی عەرەبی، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد، لە بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕان ٢٠١٢.
-مارکۆز و پۆپەر، شۆڕش یان ریفۆرم، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی، چاپخانەی شڤان ٢٠٠٣.



# جەمشید خان

## دیرۆکی مەملەکەتێکی فوێناوی دەگێڕێتەوە

**ئەردەڵان عەبدوڵڵا**

«جەمشید خانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد»، ناونیشانی رۆمانی بەختیار عەلییە. ئەم رۆمانە کە لە قاڵبی کارێکی «مینیمالیستیدا» دەردەکەوێت، یەکێکە لە کارە نایابەکانی نووسەر، هەروەک چۆن کاتێک بینەر سەیری فیلمێک دەکات، گەر لە ٥ دەقیقەی یەکەمدا، نەچێتە ناو دونیای فیلمەکەوە، ئەوا تاقەتی بینینی ئەو فیلمەی نابێت، رۆمانیش بە هەمان شێوە، گەر لە ٥ لاپەرەی یەکەمدا، نەتوانێت خوێنەر بخاتە ناو رۆمانەکەوە، ئەوا خوێنەر لە خۆی دوور دەخاتەوە و تاقەتی خوێندنەوەی ئەو رۆمانەی نابێت. رۆمانەکەی بەختیار عەلی، هەر لە سەرەتاوە ماگنێتێکی گەورەی  هەیە و دەتوانێت خوێنەر بۆ ناو رۆمانەکەی ڕابکێشێت.

# رۆمانی جەمشید خانی مامم، لە ڕێگەی فەنتازیاوە بە تایبەت «فڕینی جەمشید خانەوە»، هەوڵی داوە مێژووی گەلەکەمان بگێڕێتەوە

### رۆمانی فەنتازیی

یەکێک لەو گۆڕانکارییە گەورانەی کە ئەمڕۆ ئەدەبی جیهانی گرتووەتەوە، زاڵبوونی ئەدەبی فەنتازی و ئەفسانەییە. لەم چەند ساڵەی دواییدا ئەو رۆمانانەی کە ناوبانگێکی باشیان پەیداکرد و فرۆشیان زۆر بوو، هەموو دەچنە قاڵبی ئەدەبی فەنتازیاوە. لەوانە (هاری پۆتەر، داڤینشی کۆد).

بەداخەوە ئێمەی کورد، زۆر درەنگ ئاگاداری ئەم ژانرە گرینگەی ئەدەب بووین، هەرچەندە لەم چەند ساڵەی دواییدا چەند هەوڵێک دراون، بەڵام بە پێی پێویست نەبووە، یان دەتوانم بڵێم کە زۆر کەم بووە.

رۆمانی جەمشید خانی مامم، لە ڕێگەی فەنتازیاوە بە تایبەت «فڕینی جەمشید خانەوە»، هەوڵی داوە مێژووی گەلەکەمان بگێڕێتەوە.

جەمشید خان کوڕێکی خوێنگەرمی شیوعییە، ساڵی ١٩٧٩ لە تەمەنی حەڤدە ساڵییەوە دەگیرێت. پاش لێدان و ئەشکەنجەدانێکی زۆر، ئەم کوڕە کێشێکی زۆر لەدەست دەدات و وای لێدێت کە «با» لەگەڵ خۆیدا بیبات. کاتێک لە حەوشی زیندانی ئەمنی کەرکووکدا، بایەک هەڵدەکات و بۆ یەکەمجار جەمشیدخان دەفرێت، لێرەشەوە رۆمانەکە دەست بە هۆنینەوەی رووداوەکانی تر دەکات.

### گێڕانەوەی مێژوو بەشێوەیەکی فەنتازی

دیارە نووسینەوەی مێژوو کارێکی ئاسایی نییە، لەبەر ئەوە هەموو کاتێک نووسینی رۆمانێکی مێژوویی، کارێکی زۆر زەحمەت و ئاڵۆزە. بە تایبەت مێژووی گەلێکی چەوساوەی وەکو کورد. ئەم رۆمانە هەوڵی داوە باسی چەند قۆناغێکی گرینگی گەلەکەمان بۆ بکات. لە هەمان کاتیشدا چەند وێنەیەکی ژیانی کۆن پیشانی نەوەی نوێ داوە، کە نەیدیوە و ئاگای لێیان نییە.

بەڕاستی زۆرم بەلاوە سەیرە، کە چۆن بەختیار توانیویەتی ئەو هەموو شتە گرینگ و پڕ بایەخانە بخاتە ناو رۆمانێکی ١٥٠ لاپەڕەییەوە. بەڕاستی دەستڕەنگینی و شارەزاییەکی ئێجگار باشی نواندووە، لە نووسینەوەی ئەم رۆمانەدا.

جەمشیدخان باسی چەند قۆناغێکی گرینگی کردووە. لەگەڵ هەر فڕین و دابەزینەوەیەکی بۆ سەر زەوی، باسی قۆناغێکی مێژووی گەلەکەمان دەکات. لەساڵی ١٩٧٩وە دەست پێدەکات تا ئەمڕۆ.

لە هەمان کاتیشدا بۆ هەر قۆناغە و کەسایەتییەکی هەڵبژاردووە، کە گوزارشت لە قۆناغێکی مێژوویی دەکات. جەمشید خان وەکو (شیوعییەک، جەنگاوەرێکی ناو شەڕ، سەربازێکی هەڵهاتوو لە بارانۆک، خەباتگێڕێکی کورد دژ بە رژێمی فاشیستی تورکی، مەلایەکی ساختەچی، قاچاخچییەک لە ئەستەنبووڵ کە خەڵکی دەبات بۆ یۆنان، پاشان رۆژنامەنووسێکی ساختەچی، لە کۆتاییشدا وەکو ئاژەڵێکی ناو قەفەز، باسی ژیانی مەسئوولە گەندەڵەکان دەکات.)

دیارە جەمشیدخان لەگەڵ فڕین و دابەزیندا، کەسایەتییە کۆنەکەی ژبیر دەکات و کەسایەتییەکی نوێ هەڵدەگرێت. بەم شێوەیەش نووسەر توانیویەتی گوزارشت لە چەند کەسایەتییەکی جیاوازی ناو کۆمەڵگەی کوردەواریمان بکات.

سەرەتا باسی چیرۆکە تۆقێنەرەکانی زیندانی بەعسییەکان دەکات. زیندانییەکانی بەعس یەکێکە لە زیندانییە تۆقێنەرەکانی جیهان. مەگەر زیندانی




زۆرم بەلاوە سەیرە، کە چۆن بەختیار توانیویەتی ئەو هەموو شتە گرینگ و پڕ بایەخانە بخاتە ناو رۆمانێکی ١٥٠ لاپەڕەییەوە. بەڕاستی دەستڕەنگینی و شارەزاییەکی ئێجگار باشی نواندووە، لە نووسینەوەی ئەم رۆمانەدا



تورکی هێندەی زیندانی بەعس، تۆقێنەر و نامرۆڤانە بووبێت. هەروەک رۆماننووسی گەورەی ئەمریکی Billy Hayes بیلی هایس لە رۆمانی نیوەشەو ١٢ Uhr nachts – Midnight Express باسی وەحشیگەریی و کردارە نامرۆڤاییەکانی ناو زیندانی تورکی دەکات. بەختیار عەلیش هەوڵی داوە، لە رێگەی جەمشید خانی شیوعییەوە تشیکێک بخاتە ناو ژیانی زیندانی سیاسی لە سەردەمی بەعسدا.

لە پاش ئەوەی بۆ یەکەمجار جەمشید خان لەزیندان دەفرێت، قۆناغی زیندانی کۆتایی دێت و سەرەتای قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات، کە ئەویش قۆناغی جەنگی نێوان عێراق و ئێرانە. هەرچەندە بە بڕوای من ئەمە جەنگی گەلی عێراقی و ئێرانی نەبوو، بەڵکە زیاتر جەنگی سەدام و خومەینی بوو. لەبەر ئەوە من لەگەڵ ناوە رەسمییەکەی ئەم جەنگەدام (قادسیەی سەدام). لە پەنادا پێویستە ناوی خومەینیشی بۆ دابنێین، واتە (قادسیەی سەدام و خومەینی). چونکە ئەم دوو وڵاتە لەلایەن دوو ملهوڕ و دیکتاتۆرەوە حکوم دەکران. هیچ کاتێک خەڵکی ئەم دوو وڵاتە بڕیاری شەڕیان لەگەڵ یەکتری نەداوە.

جەمشیدخان لە دووەمین فڕینیدا مەرگەساتی ئەو جەنگەمان بۆ دەگێڕێتەوە. یەکەمجار لە سەنگەری عێراقدا کار دەکات، لێ پاش فرینێکی تری، دەکەوێتە بەرەی ئێرانەوە، ئەمەش وا دەکات، کە خوێنەر ئاگاداری هەردوو بەرەی جەنگەکە بێت. هەروەها ئاگاداری ئەو ئەتمۆسفێرە (جەوی) بێت، کە باڵی بەسەر هەردوو بەرەی شەڕکەردا کێشاوە، چۆن هەردوولا هەوڵی بەشەیتانیکردنی ئەوی تر دەدات.

لە سێهەم فڕینیدا، جارێکی تر جەمشید خان دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمان، لە گوندی بارانۆکدا، سەرهەڵدەنێتەوە. گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی، رێگە خۆش دەکات تا نووسەر باسی کاولکاری و گوند چۆڵکردن و سیاسەتی (زەوی سووتاندنی) بەعس بکات. لێرەدا جەمشید لەگەڵ سالاری برازایدا، ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە، هەتاوەکو ڕاپەڕین. لێرەشەوە باسی قۆناغێکی تری مێژوویی گەلەکەکان دەکات، قۆناغی دوای ڕاپەڕین.

جەمشید کاتێک دەگاتەوە ناو شار، کەسایەتییەکی تری دەبێت، کەسایەتییەک کە حەزی بە خۆشیی ژیانە و بە تەواوەتی ناخۆشیی ژیان بێزاریکردووە. پاش ماوەیەک سافیناز خان دەخوازێت، لێ ئەم ژنە دەتوانێت فێڵی لێبکات و جارێکی تر بۆ ئاسمان بیفڕێنێت و دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت.

لەم فڕینەشیدا، دەکەوینە ناو جیهانێکی تری ئەم مەملەکەتەوە، کە ئەویش بریتییە لە خەباتی کوردی باکوور و شەڕی گەریلا لە دژی رژێمی فاشیستی تورکی. لێرەدا جەمشیدخان دەبێتە پێشمەرگەیەکی لەشکری خەباتگێرانەی باکوور، لێ پاشان دەفرێت و دیسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوشار.

کاتێک دەگاتەوە ناو شار، جارێکی تر کەسایەتییەکی تر وەردەگرێت، کە خۆی لە کەسێکی ئایینیدا دەبینێتەوە. لێرەشەوە نووسەر باسی مەسەلەی بەهێزبوونی رۆڵی ئایین لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا دەکات. لە هەمان کاتیشدا باسی ڕەوتە ئیسلامییەکان دەکات، کە لە پاش ڕاپەڕینەوە بەهێزبوون و هەوڵی ئەوە دەدەن، کە هەژموونی خۆیان بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنن.

ئەمجارەشیان دیسانەوە جەمشید خان دەفرێت و



پاش ماوەیەک دەنیشێتەوەو کەسایەتیی پێشووی ژبیر دەکات و خۆی لە ناو کەسایەتییەکی نوێدا دەبینێتەوە.

لە پاش ڕاپەرین، بە هۆی شەڕی ناوخۆ و ئابڵوقەی ئابووری و جێگیرنەبوونی باری سیاسی کوردستان، «کۆچ» بەهێزترین دیاردەی ئەم قۆناغەیە. کۆچی بە کۆمەڵی گەنجان و لاوانی ئەم گەلە، پانتاییەکی گەورەی ئەم قۆناغە لەخۆدەگرێت. باندە قاچاخچییەکان، ئەوانەی خەڵکیان وەکوو مەڕ دەکردە قورگی «جەندرمە وەحشییەکانی تورکیاوە، یان نەهەنگەکانی ناو دەریای ئیجەوە». جەمشیدخان لەگەڵ سالاری برازای دەچێتە ئەستەنبووڵ و دەبێتە قاچاخچییەکی گەورە. زۆر لێزانانە نووسەر باسی جیهانی قاچاخچێتی و گوزەرانی خەڵکی ئاوارەی کورد لە تورکیا دەکات. لە هەمان کاتیشدا زۆر شارەزایانە باسی ئەو قاچاخچیە بێ ویژدانانە دەکات، کە چۆن لەسەر ژیانی خەڵکی ئاوارەوە، فیرعەون ئاسا لە ئەستەنبووڵ دەژیان.

لێ دیسانەوە جەمشیدخان بە دەستی سالارەوە گوم دەبێت و ماوەیەکی زۆر لە نێوان کیشوەری ئاسیا و ئورووپادا دەگەڕێت، بەڵام پاش ماوەیەکی زۆر دیسانەوە دەگاتەوە نیشتمان. بەمەش باسی قۆناغێکی تر دەکات، کە دەتوانین بڵێین قۆناغی پاش داگیرکردنی عێراقە لەلایەن ئەمریکاوە.

لەم قۆناغەدا دوو شتی گرینگ باس دەکات، یەکەمیان بوونی ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامە و گۆڤار. ئەم زۆرییەش وای کردووە کە بۆر بێت. دووەمیان: مەسەلەی گەندەڵبوونی سیستەمی سیاسی و بوونی مەسئوولی گەندەڵ.

ئەمجارەیان جەمشید ئاژانسێک دادەنێت، کە زیاتر وەکو ئاژانسێکی سیخوورییە، هەڵبەت لە قاڵبی ڕۆژنامەگەریدا دەردەکەوێت، بەڵام دیسانەوە جەمشید دەکەوێتە هەڵەوەو، تاچار جارێکی تر بۆ ئاسمان دەفرێتەوە.

لە دواهەمین نیشتنەوەیدا ناخۆشترین قۆناغی



ژیانی جەمشید دەست پێدەکات، کاتێک لە ماڵی مەسئولێکدا، وەکو مەیموونێک دەیخەنە قەفەزێکەوە و دەبێتە جێگەی گاڵتە و مەسخەرەی شەوانی ئەم مەسئوولە. لێ دیسانەوە سالاری برازای بە هانایەوە دەچێت و لەو قەفەزە رزگاری دەکات. لە پاش رزگارکردنی بۆ دواجار سالار دەیباتەوە بۆ ئاسمان و لەم وڵاتە دووری دەخاتەوە، چونکە چیتر ناتوانێت وەکو مرۆڤێکی ئاسایی بژی. لە پاش ماوەیەکی زۆر، جەمشیدخان لە وڵاتێکی دووری ئاسیاویدا، دەنیشتێتەوە و باری ژیانی دەگۆڕێت و چیتریش ترسی لە «با» نابێت بیفڕێنێت.

## چەند سەرنجێک

دیارە من زیاتر وەکو خوێنەرێکی ئەکتیف قسە لە سەر ئەم رۆمانە دەکەم، بە دڵنیاییەوە کەسێکی تر جۆرە خوێندنەوەی تایبەت بە خۆی دەبێت بۆ ئەم رۆمانە. ئەوەی جێگەی سەرنجە نووسەر لەم رۆمانەدا، لە هەندێک شوێندا دەزووی بۆ جەمشید خان درێژکردووەتەوە و لە هەندێک شوێنیشدا بەپەلە فڕێی دەداتەوە سەر زەوی.

بۆ نموونە کاتێک لە مەیدانەکانی جەنگەوە لە باشووری عێراقەوە، فڕێی دەداتە لای شاری ئەسفەهان. لە پرێکیشدا سواری کەرێکی دەکات و دەیکات بە گوندی بارانۆکدا. یان بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئاسمانی هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەورووپادا، دەزووی بۆ شل دەکات و بەو ناوچانەدا دەیفڕێنێت. بەبێ ئەوەی خوێنەر بزانێت، کە ئاخۆ لەو ماوە زۆرەدا جەمشید خان چیی کردووە. بەیەک دوو دێڕ، باسەکە لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە و دەیخاتە ناو جیهانێکی ترەوە.

خاڵێکی تر کە جێگەی سەرنجە، ئەوەیە نووسەر لەم رۆمانەیدا بە شێوازێکی خراپ باسی «ژن و خێزان» دەکات، لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکی ئادەم و حەودا، لە زاری جەمشیدەوە دەڵێت:

(خودا وەک باوکێکی خۆرهەڵاتی سزای دەدات، بەوەی ژنی بۆ دەهێنێت. ل١٠٣)

لە شوێنێکی تردا دەڵێت:

(پێم نەگووتی پیاو یەک جەهەنەمی هەیە، ئەویش ژنە. ل١١٠)

زۆر جار هەست دەکەم بەختیار کەوتووەتە ژێر کاریگەریی نووسینەکانی نووسەری میسری «ئەنیس مەنسور»ەوە، کە بە یەکێک لە دوژمنانی ژن دادەنرێت. زۆرجاریش لە شێوەی ساتیردا، ئەم بۆچوونە خراپانەی دەرخستووە. هەروەها تا ڕادەیەکیش کاریگەریی بۆچوونە خراپەکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی «نیتچە»ی پێوە دیارە.

خاڵێکی تریش کە جێگەی سەرنجم بوو، لە هەندێک شوێندا بەختیار حوکمێکی گشتگیرانە بۆ هەندێک رووداو دەردەکات. بۆ نموونە کاتێک باسی کێشەی زۆربوونیی رۆژنامە و گۆڤار و سایتی کوردی دەکات، زۆر گشتگیرانە حوکم لەسەر ئەم دیاردەیە دەدات. دیارە راستە زۆربوونی ئەو هەموو سایت و رۆژنامانە، زۆر شتێکی باش نییە، بە تایبەت سایتە ئەلکترۆنییەکان، بە حکومی ئەوەی هیچ سانسۆرێکی حکومیان لەسەر نییە، زۆر جار لادانێکی زۆری پێوە دیارە، کە زۆر دوورە لە یاسا و نەریت و مۆڕاڵی نووسین و رۆژنامەگەرییەوە. لە هەندێک سایتەوە زۆر ناشرین و بە شێوازێکی نزم، هێرش دەکرێتە سەر خەڵکی، بە تایبەت خەڵکی سیاسی و ناسراوی گەلەکەمان. دیارە بەختیار عەلیش زۆرجار

بووەتە تیری ئەم سایتانە.

«لای ئێمە کەوچکێک لە نووسەری خراپ تێکەڵ بە کەوچکێک لە سیاسی خراپ بکە و جوان ڕایانوەشێنە و چەند کەوچکێک لە گیراوەی مەلای خراپیان تێکەڵاو بکە و تۆزێک لەگەڵ ئاودا بیانخەرە سەر ئاگر و بیانکوڵێنە، ئەوە ڕۆژنامەنووسی عەیارە بیستووچواری وڵاتی ئێمەی لێدەردەچێت.ل١٢١»

لە سەدەی پێشوودا میرغەزەبەکانی تورک، حکومێکی گشتگیریان بۆ لەناوبردنی کورد و ئەرمەنی دەرکرد و کەوتنە قەتلوعامکردنی خەڵکی، ئەڵمانەکانیش پاش ئەوەی بە زۆرینەی دەنگ، دەنگیان بە هیتلەر دا، ئینجا هیتلەریش فەرمانێکی خوێناوی دەرکرد، بە کۆمەڵکوژی جوولەکە لە جیهاندا.

لە پاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە، مرۆڤایەتی لە پاش ئەم جەنگە وێرانەیەدا، ڕاستە فێری ئەوە نەبوو کە چیتر بڕیاری گشتگیرانە لەسەر بابەتێک یان ڕووداوێک یان گەلێک نەدات، لێ مرۆڤایەتی فێری ئەوە بوو کە دژی ئەم جۆرە بڕیارانە بوەستێتەوە، چونکە زەرەری بۆ مرۆڤایەتی هەیە، دوورە لە بڕیاری عەقڵانییەوە.

نووسەر کە دەسەڵاتی بەسەر قەڵەمدا هەیە، نابێت حوکمێکی گشتگیری بۆ دیاردەیەک یان ڕووداوێک دەربکات. ناکرێت گەر کەمێک زەرەرمان لە ئازادیی ڕۆژنامەگەری کرد، یان گەمژەیەک شێتانە بەردی تێگرتین، ئیتر یەکسەر نەفیری عام بۆ هەموو ڕۆژنامەنووسێک دەربکەین.

## تەکنیکی نووسین

دیارە لەم ڕۆمانەیدا بەختیار عەلی زۆر شارەزاییانە




تەکنیکی ڕۆمانی بەکارهێناوە، هەر ئەم تەکنیکی ڕۆمانەش وای کردووە، کە خوێنەر زیاتر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. نووسەر زۆر بە باشی تەکنیکی «فلاش باگ»ی بەکارهێناوە، توانیویەتی لەم ڕێگەیەوە، چیرۆکەکان بگێڕێتەوە. هەروەها زۆر بە باشیش سوودی لە بەکارهێنانی «گرێ»ی ناو ڕۆمان بینیوە، بەتایبەت لە کاتی باسکردنی «ئاژانسەکەی جەمشید خان»دا، هێدی هێدی «گرێ» کە دەکاتەوە و خوێنەریش بێتاقەت نابێت، لە دواکەوتنی چیرۆکەکە، بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆمانەدا ڕەگەزی «کتوپڕ»ی زۆر کەم تێدایە، گەر تێشیدا بێت خوێنەر هەستی پێ ناکات.





دیارە ڕەگەزی «کتوپڕ» چێژێکی زیاتر بە ڕۆمان دەدات. جێگەی ئاماژەیە نووسەری مەزنی رووسی «دۆستۆیڤسکی»، بە ئوستادی ئەم ڕەگەزە دادەنرێت.

بەڵام لە رووی زمانەوە، نووسەر هەوڵی داوە بە زمانێکی زۆر ساکار و ئاسان بنووسێت، بە شێوەیەک کە هەموو کەس دەتوانێت لێی تێبگات و بتوانێت مامەڵە لەگەڵ دەقەکاندا بکات. بە بڕوای من بەکارهێنانی ئەو جۆرە زمانە، وایکردووە کە خوێنەرێکی زۆر بۆ ڕۆمانەکە ڕابکێشرێت. لێرەدا نووسەر «زمان»ی وەکو ئامرازێک بەکارهێناوە، تا لە ڕێگەیەوە بتوانێت چیرۆکەکەی خۆی بۆ خوێنەران بگێڕێتەوە و هەر لە ڕێگەی زمانیشەوە، بتوانێت پەیوەندی بە خوێنەرەوە بکات.

## دواقسە

بە بڕوای من ئەمە یەکێکە لە ڕۆمانە باشەکانی ئەم چەند ساڵەی دواییمان، بە ڕاستی خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە، بەتایبەتی بۆ نەوەی نوێ زۆر گرینگە، چونکە لە ڕێگەی ئەم ڕۆمانەوە، نەوەی نوێ دەتوانێت شارەزایی و ئاگادارییەکی زۆری، لە چیرۆکە ناخۆشەکانی نەوەی پێشوو هەبێت.
جارێکی تر دەستخۆشی لە نووسەر بەختیار عەلی دەکەین و هیوادارین بە دڵێکی فراوانیشەوە سەرنج و بۆچوونەکانمی وەرگرتبێت.

**سەرچاوە:**

بەختیار عەلی، جەمشید خانی مام کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئەندێشە، ساڵی٢٠١٠.



# فریشتەکانی دوێنێ کوان؟
# ئامێرە دڕندەکانی ئەمڕۆ ئەوەتان

**هەرێم عوسمان**

**«شۆڕش لەسەروو ژیانی ئەو کەسانەوەیە کە دەیەوێت ڕزگاریان بکات»(١)**
**ئەلبێر کامۆ لە مرۆڤی یاخیدا.**

**«شۆڕش فەرمانی دا من مرۆڤ بکوژم دەبێت بیکوژم»(٢)**
**بەختیار عەلی لە کەشتیی فریشتەکاندا**



هەندێک وشە هەن مرۆڤ نازانێت گوزارشت لە چاکە یان خراپە دەکەن، بۆچی ئەو دالانە مەدلوولەکەیان هێند سرک و پڕ جووڵەن، نازانرێت خۆیان خیانەتکارن یان ئێمە خیانەت دەکەین و وشەکان بۆمان دەپۆشن، ئەو وشانە تاوانی خۆیانە یان تاوانی ئێمەی مرۆڤە، کە ماناگەلێکی دژبەیەکی لە خۆیدا هەڵگرتووە، ئەوان نوێنەری مانان یان خۆیان مانان یان ئێمە ڕێککەوتوین ئەو مانایەیان هەبێت کە خۆمان دەمانەوێت، ئەوان وامان لێدەکەن هەندێکات ناشرینیمان بە جوانی لێبگۆڕێ، تاوان بە ئەرک بزانین، خیانەت بە جوانی پەسن کەین. وشەکان کارێک دەکەن ژیان بە جۆرێکی تر ببینین، ئەوە سیحری وشە و زمانە یان دەسەڵاتی مرۆڤە، زمانیشی بەندکردووەو کردوویەتییە ئامێرێک؟ دواجار ئەوە ئەوانن هێمان بۆ کردە و جووڵەکانمان بۆ لێکتێگەیشتنەکانمان، لەبەر ئەوە ئەوانیش سووچێکیان بەردەکەوێت. ئەو وشانە تەنیا لەخۆیاندا گوماناوی نانوێنن، بەڵکو بۆ ئێمەش جێی گومانن، زۆر کات گرفتمان بۆ سازدەکەن. شەیتانیی مرۆڤە وا دەکات وشەکان وابنوێنن یان شەیتانیی وشەکان خۆیانە؟ ئەم دەروازەیە هیچ نییە جگە لە بیانوویەک بۆ قسەکردن لە بارەی ڕۆمانی کەشتیی فریشتەکانەوە.

زۆر دەق هەن گرانە نووسین لە بارەیانەوە، لەبەر ئەوە نازانی لە کوێوە دەستپێبکەیت، لەناوەڕۆکەوە یان روخسارەوە، لەبەر ئەوە ئەم نووسینە زۆر گرانە لە سەرم، چونکە ڕۆمانێکی قەبارە گەورە، کە لێوانلێو بێت لە رووداو و روانین و رامان و گومان خستنە سەر بوونی مرۆڤ و کردەکانی و کەسێتیی مرۆڤە دوالیزمەکان... بەڵام بۆ ئەوەی لەم گرفتە کەمێ خۆم قوتار بکەم، هەوڵ دەدەم زیاتر لە چەند تەوەرێک کاربکەم.

## شۆڕش لە نێوان ئارەزوو و پێویستیدا

سەرەتا گرنگە ئاماژە بە شتێک بدەم، کە رەنگە پێویست بێت، چەند رۆژێ پێش خوێندنەوەی ڕۆمانی کەشتیی فریشتەکان، کتێبی مرۆڤی یاخی، کامۆم خوێندەوە، هەستم کرد پەیوەندییەکی توند لە نێوان روانینەکانی ئەلبێر کامۆ و بەختیار عەلی هەیە بۆ شۆڕش، تەنانەت بەدەر لە مانا، هەستم بە لێکچوونی ئاماژە و دەربڕینەکان دەکرد، لەبەرئەوەی خوێنەر بە هەڵە نەچێت و تێکستێکی ئەدەبیو فەلسەفی لێک جودابکاتەوە، دەبێ بڵێم زیاتر مەبەستم ئەو لایەنەیە کە تایبەتە بە شۆڕش و شۆڕشگێڕ.

ڕۆمانەکە زۆر گرنگیی داوە بە شۆڕشەکانی کورد لە ماوەی ساڵانی حەفتاکان تا ڕاپەڕین و قسەکردن لەسەر پاش راپەڕینو ئێستای کوردستان، بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی ناراستەخۆ لەسەر ئێستا وەستاوە، جگە لە چەند ئاماژەکردنێک، چونکە سنوری قسەکردن لەسەر ئێستا کەمتر دەرەوەی گرتووەتەوە بەڵکو زیاتر لە دەوری زیندانبوونی «وەفا ڕەفعەت بەگ»ەوە ئاڵاوە، لەبەر ئەوە زیاتر باسکردن بووە لەو شۆڕشانە. هاوکاتی باسکردنی ئەو شۆڕشانە، باسی ئاوابوون و وێرانبوون و مردنی بەشێکی مرۆڤ دەکات، کە هەتاوەکو شۆڕش تیژتر بێت، ئەو بەشەی مرۆڤی کورد زێدەتر لەنێو دەچێت، ئەو بەشەش ناتوانین بەتەنیا یەک ناوی بنێین (لێرەش زمان تووشی ئەم ئیحراجیەمان دەکات)، کە ئایا ئەوە وێرانبوون

و نغرۆبوونی رۆحمانە یان ویژدانمان ئەو بەشەی بوونمان کە هاندەرە بۆ کرداری باشە و چاکە و ڕێگری دەکات لەخراپبوونمان..، خۆ دەشێ هەموویان بێت. هاوشانی سەرکەوتن و بەرەو پێشچوونەکانی شۆڕش و کۆتاییەکانی شۆڕش، ئەو بەشەی بوونمان ماڵئاوایی دەکات، لەگەڵ سەرەتای ساڵانی نەوەدەکان و راپەڕینەکە و نزیکبوونەوە لە دەسەڵاتی کوردی، ئیدی لانەی فریشتەکان نامێنن، رۆحی مرۆڤی کورد لانەی لێدەشێوێت و ئارامی لێ دەبڕێت. لەبەر ئەوە پێم وایە ئاوابوونی رۆحیش دەلالەتێک بێ لە ئازادیو ویستی ئازادبوون، چونکە مرۆڤی پاش راپەڕین رەنگە لە هەندێ باردا بە جەستە ئازاد بێ، وەلێ رۆحی ئازاد نییە، ئازادیی رۆحیش زیندوویەتییە، مردنی رۆحی مرۆڤی کوردیش لەم رۆمانەدا، بەیانکەری مردنی ئازادییە بە مانا وجودییەکەی، کە ئازادی قەتیس ناکات لە ئازادی جەستەدا.

بیرمەندان ئازادی و بوون پێکەوە ئەبەستنەوە، بەهای بوون بە بەهای ئازادییەوەیە، هەر کات بوونمان بوونێکی نائازاد بوو، ئەوا بوونیش بەهای خۆی لە دەست دەدات، کاتێ بوون مانای هەیە کە ئازادی هەبێت، بێگومان ئازادییش پەیوەستە بە بوونەوە، چونکە «ئازادی بنەمای بوونی حەقیقەتە» (٣) هەموو کۆششەکان بۆ گەڕانەوەی بەهای مرۆڤ لە کۆششکردنەوەیە بۆ ئازادبوون، ئازادبوونیش هیچ نیە جگە لە مرۆڤبوون، مرۆڤ تەنیا لە دۆخی مرۆڤبووندا ئازادە، نە سەرداریو نەکۆیلەیەتی ئازادی تێدانییە، ئەو سەردارەی کە خۆی بە ئازاد دادەنێت هیچ نییە جگە لە کۆیلەی کۆیلە، بەڵام ئایا ئەو بەهایەی کە بەئازادی دەدەین و دۆستانە بە بوونی مرۆڤەوە دەیبەستینەوە، نابێ ئازادییەک بێ سنوورناس بێت؟ واتە ئایا ئازادی زۆر کات نەکراوەتە بیانووی بەرهەمهێنانی تاوان و کوشتن و تیرۆر و بەرهەمهێنانی کۆیلایەتی و ئاغایەتی؟ ئازادی نەکراوەتە بیانویەک بۆ کوشتن بەوەی هەموو شتێک شیاوە تەنانەت کوشتنیش؟ ئەوەی لە ئازادی ڕاستەقینە تێبگات لەوەش تێدەگات ئازادی دوورە لە تیرۆر.




لەم رۆمانەدا شۆڕش دەکرێت بەناوی رزگاربوون و ئازادبوونی مرۆڤ، بەڵام ئاکامەکەی شتێکی دیيە، کە مرۆڤ بێزدەکاتەوە لەو ئاکامە، گەر سەرەتا ئەم ئامانجە دیاربووایە، یان ئەو ئایندەیە رۆشن بووایە، کە چی دەبێت شۆڕش بەوجۆرە بازاڕی نەدەبوو(خۆ رەنگە واش نەبێت مرۆڤ شۆڕش بکاتە بیانوی حەزە شەڕەنگێزییەکەی خۆی)، چی وادەکات کوشتن ببێتە شتێکی ئاسایی، کۆیلایەتی ببێتە پێویستیی رۆژ؟ ئەوە حەزی مرۆڤە هانیدەدا لەوپەڕی بێ بیانوییدا بیانویەک بۆ جەنگ بدۆزێتەوە (٤). یان مرۆڤ لە بێئاگاییدایە، باشە گەر مرۆڤ دژی کوشتن دەبێتەوە ئەی بۆ دەکوژێت؟ بۆ کۆیلە دەکات لەکاتێکدا کۆیلایەتیی لا قێزەونە؟ ئەم گرێیە چییە کە لە سەرەتای بوونی مرۆڤەوە بەردەوامە؟ ئایا ئەو بۆشاییە کەی پڕدەبێتەوە، ئەو حەزە کەی تێردەبێت؟ لەم رۆمانەدا لەوە تێدەگەین کە کۆیلەگەلێک لەجیاتی ئازادی بکەنە ئامانجی شۆڕش بە پێچەوانەوە شۆڕشیان کردبووە ئامانج، لەبەر ئەوەی شۆڕش هەموو شتێکی بەرهەمهێنا ئازادی نەبێ، زۆر شتی ساز دا، زۆر شتی تیا دروستکردین، زۆر خواستی تیا چاندین، بەڵام خواستی ئازادی نا، بە



پێچەوانەوە خواستی ئازادیی تیا کوشتین، مردنی بەلێشاوی فریشتەکان هیچ نییە جگە لە خواستی مەرگی ئازادبوون، خواستی مرۆڤبوون. لەبەر ئەوە گومانی ئەوە دەبەم کە شۆڕشیش بەهانەیە نەبێ بۆ کردنی ئەو توندوتیژییە. سەیر نییە لەم رۆمانەدا زۆرێک لە کەسێتییەکان چونکە کۆیلەن–ئامێری شۆڕشن، هەر کە یەکدی دەبینن، وەک مرۆڤ یەکدی نابینن، بەڵکو وەک کەرەسە، ئامێر، کۆیلەیەک لە یەکدی دەڕوانن یان وەک سەروەر و سەردار و سەرۆک، لەبەر ئەوەی وەک مرۆڤ ناژین، نازانن چۆن مامەڵەی مرۆیی لەگەڵ یەکدی بکەن، هەمیشە لە بۆسەدان بۆ یەکدی، تا ئەم ئەو داگیر بکات یان ئەم ببێتە داردەستی ئەو، هەمیشە رقێک لە ناخی هەریەکەیان دەبینرێت، بۆ بەهانە ناگەڕێن تا بیر لە داگیرکردن و تەسلیمبوون بکەنەوە. ئەم مرۆڤانە کە وەک ئامێر ماهییەتێکی نەگۆڕیان نییە دەتوانن بگۆڕێن، بەڵام زۆر بە زەحمەت دەگۆڕێن، چونکە چیتر مرۆڤ نین، ئەوەش مایەی سەرسامی نییە، چونکە بەردەوام دۆخ بۆ یەکتری سازدەکەن تا لەنێوان کۆیلایەتی و سەرداریێتیدا بمێننەوە، زۆر بەدەگمەن تیایاندایە بگۆڕێت، گۆڕان بەو مانایەی لە کۆیلایەتییەوە بۆ مرۆڤبوون، نەک لە شۆڕشگێڕەوە بۆ خائینبوون و لە بەعسیبوونەوە بۆ کوردبوون (بە مانا شۆڕشگێڕییەکە)، ئەمانە هیچ نین جگە لە گۆڕینی رووخساری کۆیلایەتییەکە، مرۆڤبوون بۆیان بووبووە ئەو قەڵایەی هەرگیز پێی نەدەگەیشتن، بەڵکو ئەوان مەترسیی یەکەم بوون لە مرۆڤبوون، بۆ ئەو گۆڕانە مرۆڤ پێویستە ئازادی لەیاد نەکات، نەک نامرۆڤبوونی خۆی بەمرۆڤبوون لێ بگۆڕێ، واتە کە نامرۆڤە هەستنەکات نامرۆڤە یان نامرۆڤ کراوە، چونکە مرۆڤ گەر لە دۆخی مرۆڤبوون دەرچوو، ئومێد هەیە تا ئەو کاتەی هۆشیارە بەنامرۆڤبوونی.

کاتێ بوون و ئازادی بەهایان نامێنێ ئیدی ئاساییە، کە خۆت بکەیتە هۆکارێک بۆ ئەوەی شۆڕش بتکاتە هی خۆی، بتکاتە چەکێک بۆ کوشتنی ئەویدی، مرۆڤ بەهای خۆی نەزانی ئاساییە خۆی بکاتە قوربانی، بەها دانەنان بۆ خۆ، بەهادانەنانە بۆ ئازادی، هەرکاتێ بەها سەنرایەوە لە بوون و ئازادی، ئیدی مەترسی دەست پێدەکات، کاتێ وەفا رەفعەت بەهای خۆی نەزانێ ئیدی چۆن بەهای ئازادی دەزانێ، لەبەر ئەوەی وەفا بەهایەکی بەرزتر لەخۆی دانابوو، بووبووە کۆیلەی ئەو بەهایە، کە ئەویش شۆڕشە، شۆڕشیش خودایەکە و پێویستە سوجدەی بۆ ببرێت، وەفا شۆڕشی بەپیرۆزترین دەزانی، سەرۆکیش وەک خوا یان نوێنەری خوایە، لە لاپەڕە ١٣١دا باسی پەشیمانبوونەوەی و بڕیاردان لەسەر نووسینەوەی یادەوەرییەکانی وەفا دەکات لەو رابردووەی لەنێو شۆڕشدا تیا ژیاوە، گفتوگۆیەک دروست دەبێت لەنێوان نەغەدە و وەفا، نەغەدە بە وەفا دەڵێ: «بەڵام بزانە یادەوەریت موڵکی خۆت نییە» (٥) ئەم دێڕە شرۆڤەی زۆر لەخۆ دەگرێت، گەر لە سیاق دەریکەین وەک من کردوومە وەک هەواڵێک وایە، گەر لە کۆنتێکسدا بیخوێنیتەوە هەست بە هەڕەشە دەکەیت. گەر لە واتای رووخساری و سیمانتیکی دەربڕاوەکە بڕوانین، ماناکەی ئەوەیە کە شتێک هەیە ناوی یادەوەرییە ئەم یادەوەرییە راستە هی تۆیە بەڵام هی تۆش نییە، چونکە دەڵێت یادەوەریت، یادەوەریی تۆ، یادەوەریی خۆت هی خۆت نییە.

بەڵام گەر پراگماتیکییانە بیخوێنینەوە ماناگەلێکی زۆر هەڵدەهێنجین، مەبەست ئەوەیە بڵێت تۆ هی خۆت نیت، کاتێ تایبەتترین و ناوەکیترین و نهێنیترین شتی مرۆڤ هی خۆی نەبێ مانای وایە ئەو مرۆڤە لە قوڵاییدا کۆیلە کراوە، وەفا تەنیا ئامێرێکی کۆیلە نییە، بەڵکو وەک مرۆڤێکی تەواو کۆیلەیە، مرۆڤێک کە نەیتوانیوە بژی، مرۆڤێک کە ژیانی خۆی نەژیاوە، ژیانێک ژیاوە هی ئەوانی دی و بۆ ئەوانی دی، چونکە مرۆڤ گەر بژی ئەزموون کۆدەکاتەوە و یادەوەریی دەبێت، چونکە ئەزموون و یادەوەری تەواوکەر و کار بۆ یەککەری یەکدین، ئەم دێڕە ئەوەش دەڵێت مادام یادەوەریت هی خۆت نییەو خۆشت هی خۆت نیت، ئەوا هەر کردەیەکی خۆییانەو خۆبوون دەبێتە هۆی مەترسیی گەورە بۆت، چونکە تۆ ژیانی خۆت نەژیاویت ئێستا گەر خەیاڵێکی لەم چەشنەت هەبێ دەبێ مەترسییەکانی بزانیت، ئەوەی بۆ شۆڕشت کردووە شۆڕش بە خۆتی دەکاتەوە، واتە شۆڕش کردەی کوشتن و تیرۆری بە وەفا ئەنجام داوە، ئێستا وەفا لەبەر ئەوەی خیانەت لە شۆڕش دەکات و یادەوەرییەکانی کە هی شۆڕش و سەرۆکە نەک هی خۆی ئەوا هەمان کردار بەخۆی ئەنجام دەدرێ، ئەوەی دوێکە تیرۆری دەکرد، ئێستا خۆی تیرۆر دەکرێ، چونکە هەر هەڵگەڕانەوە و پەشیمانبوونەوەیەک قوربانیی دەوێت.

وەفا لە ڕێگەی شەرعییەت وەرگرتن لە شۆڕشەوە تاوانی ئەنجام دەدا، شۆڕشیش شەرعییەتی لە ئەو و لە ئەوانی ترەوە وەرگرتبوو، واتە سیستمێکی توند بە یەکیەوە گرێداون، شۆڕشگێڕان شەرعییەت دەدەنە شۆڕش، شۆڕشیش شەرعییەت دەداتەوە بە شۆڕشگێڕان، لە شۆڕشیشدا هەمیشە پاساوێکی باڵا دەدۆزرێتەوە بۆ کردنی شۆڕش کە ئازادییە، بەڵام بەناوی ئازادییەوە کۆیلەیەتی بەرهەمدێت، ئازادی تەنیا پاساوێکە بۆ هێنانە ئاراوەی داهاتوویەکی ڕەشتر، پڕ تاوانتر. وەفا و نزار و لیڤیتانت، شێرخان... شۆڕشیان کردبووە پاساوێک بۆ تێرکردنی ئەو حەزە بەدەی لە ئازاردان و کوشتنی ئەویدیدا هەیانبوو.

لەم ڕۆمانەدا تانەدان و ناشیرینکردنی شۆڕش گەیشتۆتە ترۆپک، بەڵام ئەبێ بپرسین شۆڕش کە جۆرێک لە جوانی و چاکی و تەنانەت پیرۆزیشی لای مرۆڤ هەیە، ئەتوانرێ هێندە ناشرینکرێت؟ ئایا شۆڕش خۆی لەخۆیدا هێندە ناشرین و بزێوە؟ ئەم وشەیە خۆی لەخۆیدا هەڵگری ئەم ناکۆکییە یان ئەو ئێمەین ئەم ناکۆکییەمان بەخشیوە پێی؟ شۆڕش گرنگی و بەهای خۆی هەیە، بەڵام کام شۆڕشە؟ ئایا شۆڕشێک کە لەپێناو ئازادکردن و دەرکردنی مرۆڤ بێت لە نەهامەتی، ئێمە پێویستیمان بە شۆڕشە بەسەر خودی خۆماندا، بەسەر دەرکردنی ئەو بوونەوەرە بەدەی لە ناوەوە جێ خۆشدەکات، شۆڕشێک کە بەها مرۆییە بەرزەکان لەخۆیدا هەڵگرێت، دەشێ بەپێچەوانەکەی ڕازیبین، بەواتایەکی تر ئێمە کە شۆڕشمان گەرەکە بۆ ئەوەیە چاکە زاڵکەین بەسەر خراپەدا، بەڵام ئایا دەبێ هۆکاری زاڵکردنی چاکە بەسەر خراپەدا لە ڕێگەی خراپەوە بکرێت؟ ڕوونتر بڵێین کاتێک شۆڕش بۆ ئازادکردن بێت، ئیدی چۆن دەبێت بەکۆیلەیەتی ڕازیبین، کۆیلەکردنی ئەوان بکەینە ئامانج، کوشتن و تۆقاندنی ئەوان بکەینە هۆکاری ڕزگارکردنی خۆمان. شۆڕشی ڕاستەقینە شۆڕشێکە



له یاخیبوون بەمانا کامۆییەکەی سەرچاوە دەگرێ نەک لە تیرۆرەوە. هەر شۆڕشێک لەسەر کوشتن و تیرۆر بنیادنرابێت بێگومان ئاکامەکەی بەد دەبێت. لەم رۆمانەدا ئەوە دەخوێنینەوە کە بۆچی ئێستامان بەمجۆرەیە، بۆچی ئازادیمان نییە، بۆ ژیانمان رۆژبەڕۆژ خراپترە، بۆ وێژدانمان دەمرێ و هەستی پێ ناکەین؟ لەبەر ئەوەی کە شۆڕشەکان، لە رێگەی شەرعییەت وەرگرتن لە تاوان و کوشتن و هێرشکردنە سەر ژیانی ئەوانی تر دەستی پێکرد، هەرکات شۆڕش بێباکانە کوشتنی ئەنجام دا، دەبێ بترسین لە کۆتاییەکەی، نەوەیەک پەروەردەکەی بە کوشتن و چەک دەبێ، شۆڕش بریتییە لە چاوەڕوانی یان وەک مێشیلییە ناوی نا بەرزەخ (٦) لەبەر ئەوەی قۆناغێکە تێیدا شۆڕش لە ئێستادا دەکرێت بۆ ئایندەیەکی رۆشن، هەموو کەسێک چاوەڕوانی لە شۆڕش هەیە، وەک بڵێیت شۆڕش ئەو فریادڕەسە بێت هەمووان رزگاردەکات، دەشێ سەرەتا شۆڕش ئەو مژدەیە بدات، بەڵام پاشان زۆر ئەگەرێکی زیندووە کە پەشیمانییەکی قوڵ دروستبێت، وەک چۆن وەفا تووشی ئەو پەشیمانیە بوو، لە ئێستای خۆشماندا مۆرڤگەلێکی هێجگار زۆر هەن، کە پەشیمانن لەو رابردووەی کە شۆڕشگێڕبوون. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە نابێت شۆڕشگێڕان بە کەسانی فریشتە و رزگارکەر بزانین، بەڵکو ئەوان زۆرکات بوونەتە شەیتان بۆ خۆشیان نەک بۆ ئەوانی دی، لەم رۆمانەدا زۆر جوان باس لەوە کراوە کە مەلەکبینەکان و فریشتەکان ئەوانەن شتێک لەناخیاندایە دژی شۆڕشە، بەڵام شۆڕگێڕان ئەوانەن فریشتەکانی ناویان هەر زوو دەمرێت، تەنانەت وەفا کە مەلەکبین بوو هۆکەی ئەوەبوو لەناخیدا شتێ تروسکەیەک هەبوو، کە هەر تاوانێکی بکردایە هەستی بە تاوان دەکرد، بەواتا گوناهەکردن نەبووە بەشێک لە بوونی، زۆرێک لە شۆڕشگێڕان تاوانکردن تێکەڵ بە خوێنیان ببوو، لەکردنی تاوان هیچ سڵێکیان نەدەکردەوە هیچ دەنگێک بۆ نەکردنی ئەو تاوانە لەناخیان دەرنەدەچوو، واتە بە تەواوی کەڕببوون، خاڵێکی گرنگ لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە لەنێوان کۆیلایەتییەک کە کۆیلە کەڕبووە یان دەبیستێ جیاوازیی جەوهەری هەیە، وەفا هەمیشە ئومێدێکی تیا دەبینرا، کە پەشیمانبێتەوە لە شۆڕش و لەو تاوانانەی ئەنجامی دەدا، بەڵام بۆ کەسێک کە کەڕ بووە، ئومێدی پەشیمانبوونەوەی کەمە، بەپێچەوانەی بەختیارەوە پێم وایە دیل بە زمانی گۆرانی شاعیر بووە کوڕ بۆ ئاغا، ئاغاش بووە باوک بۆ کۆیلە، ئیدی ئومێد کەمە بۆ رزگاربوون، چونکە کۆیلە هەستی کۆیلەیەتی تیا مردووە خۆشحاڵە بە کۆیلایەتی، چونکە هەست ناکات کۆیلە بێت، مردنی ئەو هەستە لە کۆیلایەتییەکە گرانترە، چونکە جولانی مێژوو بەندە بەم هەست و هۆشیارییەوە (٧)، بەڵام شۆڕشگێڕانی تر جگە لە وەفا ئەو شۆڕشگێڕانە بوون کە کامۆ باسیان دەکات «شۆڕشگێڕ مرۆڤێکە پێشوەخت بەکۆمەڵێ شت مەحکومە. نابێ هیچ پەیوەندییەکی عاتفیی هەبێ، نابێ هیچ کەسێکی خۆشبووێ، تەنانەت دەبێ لەناوی خۆیشی داماڵرێ، دەبێ هەموو بەشەکانی بوونی بۆ تاقە عیشقێک بێت: شۆڕش» (٨) واتە شۆڕش کوێر و کەڕی بکات، هیچ شتێ دی نەبینێ. هەروەک وەفاش نموونەیەکی بەرزی ئەم دوالیزمییە کە لەنێوان وازهێنانی شۆڕش و پەرستنی شۆڕشدا گیری خواردبوو، لەبەر ئەوەیە فریشتەکە گران ترازا

لێی، نەبوونی ئیرادە هۆکارێکی جەوهەرییە کە وەفا بەمجۆرە دەهێڵێتەوە، واتە وەفا لەنێوان زانین و ئیرادەدا بوو، ئەیزانی کارێکی بەد دەکات، بەڵام ئیرادەی بڕیاردانی نەبوو بۆ دەرچوون لەو کارە. لە ڕۆمانەکەدا هاتووە کە هیچ کات هاوڕێیەتی و عیشق لای شۆڕشگێڕان نەبووە، چونکە مرۆڤبوون نییە، نموونەی بەبابەتکردنی نەغەدە ماردینی بەئاشکرا ئەوەمان پێ دەڵێت شۆڕشگێڕان بەدوای هۆکاردا دەگەڕێن، تا تۆڵەی خۆیان لەیەکدی بکەنەوە، بۆشاییە بەدەکەیان پڕ بکەنەوە، تەنانەت بەناوی خۆشەویستیشەوە ئەوە دەکەن، ئەو دژایەتییەی لەنێوان نزار و لیڤیتانتدا هەبوو، بێ هێزی لیڤیتانت و شکانی لە بەرامبەر نزاردا و خیانەتکردنی، دەبوو بەشتێگەلێک تۆڵە بکاتەوە، تەنانەت شۆڕشی کردە هۆکارێک بۆ ئەوە، پاشان نەغەدەی کردە هۆکار بۆ تۆڵەسەندنەوە لە نزار، شەیدابوونی بۆ دەسەڵات و تۆڵەسەندنەوە هەرجارەو خولیای شتێکی دەبوو، جگە لە بیانوی شۆڕش و نەغەدە و کوشتنی لەخۆوە..، هەوڵی دا پارەش وەک دەسەڵاتێک بکاتە هۆکار، شۆڕش زۆرکات چەکێک بووە، بەڵام لیڤیتانت کردییە هۆکارێک تا ویستە نەگریسەکەی خۆی پێ ئەنجام بدات. نەغەدە هیچ نەبوو جگە لەکۆکردنەوەی دژەکان لەیەکدی، وەک شانەیەکی هەنگ وابوو، هەموویان لێی کۆبوونەوە، هەریەکەیان بەمەبەستێکی بەد، بەڵام ئەوەی بێ مەبەست نەغەدەی ویست نەیتوانی نەغەدەی بۆ ببێت.

شۆڕش لەم ڕۆمانەدا نموونەی شکاندنی سنوورەکانی مرۆڤ و ژیان و ئەخلاق و بەهاکانە، گرفتی شۆڕشەکان لەوەدایە کە شۆڕش وەک بەهای باڵا وێنا دەکەن، شۆڕگێڕان شۆڕشیان وەک شا بەها تەماشا دەکرد، کە هەموو بەهایەکی تر دەبێت ببێتە قوربانی ئەم بەهایە،» زۆربەی شۆڕشەکان شێوە و ڕەسەنایەتیی خۆیان لە تاوان و کوشتنەوە وەردەگرن، هەمووشیان یان زۆربەی زۆریان توندوتیژ و مرۆکوژبوون» (٩) لەبەر ئەوە شۆڕشەکان دەبێ هەمیشە جێگەی گومانبن، بەڵام کێن ئەوانەی گومان دەکەن؟ شۆڕش مرۆڤ تووشی





گومان و دوودڵی دەکات کە شەرعییەتی هەیە شۆڕشکردن یان نا؟ گەر شۆڕش نەکەین ئەی چی بکەین؟ گرنگە بپرسین شۆڕش چۆن بکەین؟ پێم وایە بە لەبەرچاوگرتنی دیدی کامۆ بۆ جیاکردنەوەی شۆڕش لە یاخیبوون و شۆڕگێڕان لە یاخبووان دەتوانین کەمێ ئەم ناڕوونییە بڕەوێنینەوە، کە یاخیبوون شتێکی خودییە و پاشان دەبێتە گشتی (من یاخیدەبم کەواتە ئێمە هەین/ئێمە تەنیاین) (١٠).، وەلێ شۆڕش بە فیکەی ئەوان سازدەبێت. هاوکات لەنێو شۆڕشدا ڕەهایی بەهای خۆی هەیە، بەڵام مرۆڤی یاخی بڕوای بەڕەهای نییە. شۆڕش مرۆڤ دەکاتە ئامێر و داشێک، بەڵام یاخیبوون خود هۆشیارییە، بەرامبەر بە ئامێربوون و بوون بە چەک بۆ ئەویتر، نە خۆی دەبێتە ئامێر نە بڕوای بەوەیە بکاتە ئامێر، ئامانج دەرچوونە لە ئامێربوون. ئامانجی یاخیبوون یەکێتییە، بەڵام ئامانجی شۆڕش سەرتاپاگیری و بەدەستهێنانی تەواوەتییە، شۆڕش «هەموو جۆرە کۆیلایەتییەک قەبوڵ دەکات تا «بەڵێ»یەک بەدەستبهێنێت، کە لە کۆتایی مێژوودا دێتەدی» (١١)، بەڵام یاخیبوون پێویستی بە بەڵێی کەسی نائازاد نییە.

شۆڕش حەقیقەتە، چونکە وەک تاکە بەها لێی دەڕوانرێ لەلایەن شۆڕگێڕانەوە. لەئێستادا چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەرم دێتەوە یاد کە ئەیویست کوڕەکەی بکاتە قوربانی، لەسەر داوای خوا. شۆڕشگێڕان بۆ ڕەزامەندیی شۆڕش زۆر تاوان و مرۆڤیان کوشت، ئیبراهیم پێغەمبەریش کوڕەکەی خۆی دەکوژێت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی، وەک چۆن وەفا و هاوەڵەکانی بۆ دانپیانانیان تاوانگەلێک دەکەن، بوونی وێژدان لەو نێوەندەدا چ ڕۆڵێکی هەیە، بوونی بەرپرسیارییەت کە یەکێک لە تەفسیرەکانی کیرکەگارد بەرپرسیاربوون بەرامبەر بە گشت(خوا)یە، بۆیە ئیبراهیم ئەوکارە دەکات، بەرپرسیارییەتی شۆڕشگێڕ بەرامبەر بە شۆڕش، بەرپرسیارییەتە بەرامبەر بە گشت؟ بەڵام کوشتن بەهەر بیانویەکەوە بێت کوشتنە، لەو ڕۆمانەدا شۆڕش بووەتە جێژوانی پیاوکوژان، لەبەر ئەوە شۆڕش لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گەلێ تاوانی قەبەی پێکردووین، قەرەبووکردنەوەی مەحاڵە، ئاسەواری شۆڕشەکان لە شۆڕشەکان خراپترن، چونکە نەوەیەکی بەرهەمهێناوە کە توانای کوشتن و بەزاندنی سنووری ژیانی هەبێت، توانای داهێنانی لە خراپەکاری و راوەدوونانی رۆحی هەبێت، لەپاش ئەو شۆڕشانە رۆحی میللەتی کورد دەکەوێتە قەیرانێکی سەختەوە، ئێستا زۆر بەئاسانی ئەوە دەبینین کە رۆژانە کوشتن و خۆکوشتن روئەدات، بیانووەکانی کوشتن و خۆکوشتن هێند لاوازن لە ئێستادا مرۆڤ نازانێ چۆن تەفسیری بکات، لەسەر پارچە زەوییەک یەکتری دەکوژین ئەمە هیچ نییە جگە لە دۆزینەوەی بیانویەک بۆ کوشتن و تێرکردنی ئەو ئارەزووە بەدە، لەم رۆمانە پێشبینیی ئەوە دەکات کە چیتر شوێنێک نامێنێ بایەخ بە رۆحی مرۆڤ بدات، چیتر کەشتییەک نییە رۆحە ترازاوە بیمارەکان لەخۆی کۆکاتەوە، کەشتییەک نابێ رۆحە ئاوارەکان هەڵگرێتەوە، رۆژێک دێت باڵەخانەکان هێند بەرزبن مرۆڤ بەسەیرکردنی سەری گێژبێت، رۆحی ئاوارە بێ، ئیدی رۆژێک هاتووەتە پێش کە ئێستا ئەزموونی دەکەین، هەموومان بریندارین، هەمووان تاوانبارین بەڵام هەستی تاوانباریمان نییە، هەمووان غەدر دەکەین، خراپە دەکەین

بەڵام لە بەرگێکی جوان خۆمان حەشارداوە، ئەمرۆ کە دەژین بێ ئەوەی تامی ژیان بکەین، هێندەی ڕۆژەکان بەڕێدەکەین هێندە ناژین (١٢) ئەمرۆ نمونەی هۆشەنگ بولبولیار هێجگار کەمە. هەمیشە شۆڕش پێویستی بە مرۆڤی نامرۆڤ هەیە، گەرەکیەتی کۆمەڵێ ئامێرە مرۆڤ کۆبکاتەوە، بێ ئەوەی بپرسێت بکوژێت. سەیرە شۆڕش هەمیشە پەلکێشمان دەکات بۆ خۆیمان دەبات، دڵنیان دەکوژرێین، دەکوژین، بەڵام بەردەوام سۆزێکمان بۆ شۆڕش هەبووە، جگە لەم سیحرە شۆڕش ئەو سیحرەشی هەیە، کە وەفا ئەندامێکی باش بوو یان نا، لەوکاتەدا کە دەیەوێ لە شۆڕش هەڵبێ، بەڕوکەش شۆڕشگێڕە بەڵام هەر دەکرێ کاری خەتەرناک و مرۆڤکوشتنی پێ ئەنجام بدرێت، کوشتنی ئەو چوار ژنە، بەدەستی وەفا نیشانەی ئەوەیە کە شۆڕش چ سیحرێکی هەیە، هاوکات وەفا لە هاواری ناخی خۆی کەڵک وەرناگرێ، واتە گەر ململانێیەک لەنێوان هاواری دەرەکی/ ئەوان ببینین لەگەڵ هاواری ناخەکی/ فریشتەکە، بەڵام وەفا دۆڕا، وەفا گوێڕایەڵی ئەوانبوو نەک گوێڕایەڵی هاواری ناخی، گومانم بۆ دروستبوو مرۆڤ هێند ئیرادەی نەبێ گوێ لە ناخی خۆی بگرێ. لەبەر ئەوەیە کامۆ دەڵێت «شۆڕش هەم مرۆڤ و هەم پرەنسیپەکانیش لەناو دەبات» (١٣). وەفا پاش کوشتنی ئەو چوار ژنە دانپیانانێکی کوشندە و خەتەرناک دەردەبڕێ، کە دەڵێ بە کوشتنی ئەو چوار ژنە بێخەتایە دەرگام لەسەر ڕۆژگارێکی تازە کردەوە. ئەم دانپیادانانە بەبڕوای من قورساییەکی زۆری لەخۆیدا هەڵگرتووە، کە خوێندنەوەی زۆر هەڵدەگرێت، چونکە ڕۆژگارێک باسدەکات کە دێت و مەترسیدارە، کە کوشتنی بێخەتا زاڵدەبێت بەسەر ئەو ڕۆژگارەدا، کە مەبەست ئەم ڕۆژگارەیە. کارەساتە بە کوشتن دەرگا لەسەر ڕۆژگارێکی نوێ بکەینەوە!

**دوالیزم و ناکۆکی، لە نێوان زمان و ڕاستیدا**

کاتی ئەوەیە لە بابەتێکی گرنگ بدوێین، دوالیزمی کەسێتیەکان و کردەکان و زمان...، دڵنیام خوێنەری ئەم بابەتە هەست بەم دوالیزمییە دەکات، کاتێ باسی وەفا دەکەم بەئاسانی ئەوەی بۆ دەردەکەوێت، بەڵام گرنگە بپرسین ئەم دوالیزمییە چییە وا لە کەسێتییەکانی نێو ئەم ڕۆمانە دەکات، کە بەردەوام خوێنەر تووشی قەلەقی و دۆخێکی نائاسایی ببێت لە نێوان ئەڕێنی کرداری کەسێتییەکان یان شەرعیەتدان بە هەندێ کردار، کە ئەو کەسێتییە خۆی شایەنی ئەوە نییە شەرعییەتی پێ بدرێت، واتە کەسێک مرۆڤێکی باش نییە، بەڵام کردارێک دەکات نازانی ئایا ئەو کردارەی ڕەنگدانەوەی کەسێتیی خۆیەتی خراپە یان چاکە، ئەم ڕۆمانە ڕۆمانی ڕووپۆشکردنە، ڕووپۆشکردنی کردارەکان بە زمانێک کە توانای تاوانبارکردنی بکەرەکە گراندەکات لەسەر خوێنەر، نزار کردەکانی ترسناکن، بەڵام بیرکردنەوەیەکی قوڵ و ورد دەبینرێت کە پاساو بۆ کردەکانی بهێنێتەوە، من لەگەڵ نزار کۆکم لە تابووکان بدرێت، بەڵام ڕێگەی ڕەخنەکە چییە، ئا لێرەدا لەگەڵ نزار تووشی گرفت دەبم. وەفا بریتییە لەم دوالیزمییە، وەفا تاوانبارێکی گەورەیە کە نووسەری ڕۆمانەکەشە، بە واتا ڕەخنەگرێکی گەورەشە لە تاوانەکانی خۆی، خۆی خراپە دەکات و دژی





خراپەش دەجەنگێت، نازانیت ئایا ئەم تاوانبارە گەورەیە دەستخۆشیی لێ بکەیت لەوەی ئەگەر ئەو نەبوایەتە جاسووس نەیدەتوانی ئەو هەموو نهێنییە ئاشکرابکات، نەیدەتوانی ئەم رۆمانە بنووسێت، یان گەر تاوانبارێکی راستەقینەیە بۆ توانای دیدتنی فریشتەکەی خۆی هەیە؟ وەفا لە نەغەدە و نزار ئاڵۆزترە، چونکە لە یەکەم کردەیەوە ویژدانە زیندووە بیمارەکەی لە نێوان بوێری و پەشیمانیدا کە ئەسپەکانی کوشت دەرکەوت.

نەغەدە کە خیانەت لە دکتۆر شوکاکی مێردی دەکات، تا چەند شەرعییەتی بدرێتێ، ئایا نەغەدە مافی خۆی نییە کە ئەو هەستانەی خۆی بژی و ئەزموون بکات، مافی خۆی نییە ئازادبێت؟ بەڵام ئایا بێباکی و ئازادی برای یەکترین، یان دژی یەکترین؟، ئەم دوالیزمییە چییە لە نەغەدەدا، بۆچی دەبێت حەزی بەهەشت و دۆزەخ بە یەکەوە بێن؟ بێباکی لێدانە لە ئازادی، نەغەدە تێگەیشتبوو ئازادیش وەک دیلی چەندین رووی هەیە (١٤). بۆ دەبێت لە نێوان تێرکردنی ویستی جەستە و رۆحدا گرفت هەبێ، گەر مرۆڤ یەک بێ، ئەم جیاوازییە چییە؟ ئەمە گرنگە هەم وەک رەخنە لە بەختیار عەلی بگرین، هەم دەشێ وەک سەرکەوتووی ئەو تەماشاکرێت. زۆر کات تاوان دەکرێ، بەڵام بە زمان و کۆمەڵێ کەرەسە رووپۆش دەکرێ، خوێنەر تووشی حاڵەتێکی نائاسایی دەبێت لە بڕیاردان.

پەیوەندیی شۆڕش و ویژدان، خوێندنەوەی کتێب و بەکارهێنانی کتێب و بۆ ئەوەی نزار تاوانەکانی جوانتر بکات، کۆکردنەوەی خوێن و کتێب، واتە کردەی تیرۆری عەقڵانی، لە مێژوودا وەک کامۆ دەڵێت چەشنی ئەمجۆرە تیرۆرە زۆرە، هەروەک مارکس و نیچە لای کامۆ روویەکی ئەو جۆرە لە تیرۆرن، کە درێژەپێدەری جۆرە تاوانێک بوون بە پاساوی عەقڵ. لەلایەکی ترەوە نموونەی دکتۆر شوکاک و دکتۆر شێرخان لەم رۆمانە دوو جۆر مرۆڤی زۆر دژ، دکتۆر شێرخان، پسپۆری بواری کوشتنە، دکتۆر شوکاک پسپۆری بواری رۆحە، نوێنەری چاکە و خراپەن لە بواری تەندوستیی رۆمانەکەدا.

ئەو زمانەی کە نزار قسەی پێدەکات وا لە خوێنەر دەکات، گومان بکات، چونکە ئەو کارەی نزار پێویستە، رۆشنبیران کاریان هەر ئەم کارە بووە، بە کەمێ جیاوازییەوە، نیچە بخوێنیتەوە لە زۆر شوێندا نزار دەبینیت، بەڵام دەشێ جیاوازیی جەوهەرییان هەبێت، هەرچەند ئەم بڕیارە گرانە، بەڵام وەک دەربڕینێک کە خوێنەری رۆمانەکە بووم ئەم هەستەم لا دروستبوو، هاوکات جگە لەوەی کە ئەو جۆرە پەسنەی نەغەدە بۆ مناڵی دەکات بە زمانێک و بە چەشنێک دەیکات خوێنەر نازانێت قینی لە نەغەدە بێت، کە دایکێکی دڵرەقە یان بەزەیی پێدا بێتەوە و شەرعییەتی بداتێ، کە بەو چەشنە مامەڵەی مناڵەکەی خۆی دەکات. هەروەک فریشتەکان مرۆڤپارێزن یان مرۆڤەکان فریشتەپارێزن، بە پێی مێژووی ئاینەکان ئەوە فریشتەیە مرۆڤ دەپارێزێ، بەڵام لەم رۆمانەدا بە پێچەوانەوە راستە، ئەمە تا رادەیە شکستدێنێ، هەم سەریش دەکەوێ، چونکە راستە دەڵێت فریشتەکان، لە سێ جۆر مرۆڤدا دەمرن، ئەوانەی دەرهەق بە درندەیی بێباکن، ئەوانەی بوونەتە ئامێر، ئەوانەی لە مەزنیی مرۆڤ تێناگەن و بۆی ناژین (١٥). ئەوەش گرنگە راستە کە فریشتە پاسەوانی مرۆڤە، چونکە لە رۆمانەکە

زۆر بەرونی دەرکەوت کە پارێزەری مرۆڤبوونی مرۆڤ فریشتەکانن، ئەوەی بولبولیاری جوان و خۆشەویست کردووە، مانەوەی فریشتە و رۆحە زیندووەکەیەتی، مردنی فریشتەکان وەک مردنی رۆحی مرۆڤەکان وایە، زۆر هەن هەست دەکەن کە رۆحیان هێدی هێدی دەمرێ وەک وەفا، بەڵام هەیە بە پێچەوانەوە تا مردنیش هەست بەوە ناکات کە رۆحی هەیە، واتە لە مەستییەکی تەواودایە، لەبەر ئەوە بوونی فریشتە وەک بوونی ویژدان وایە. بۆیە فریشتە یاریدەدەریی مانەوەی مرۆڤە لە دۆخی مرۆڤبوون و هۆشیاربوون بە نامرۆڤبوونی.

لە لاپەڕە ٧٤٠دا بە جۆرێک باسی خیانەت کراوە، کە وادەکات حەز لە خیانەت بکەیت، سیحری زمان زۆر خەتەرە، لەم دیمەنە بڕوانین هەست دەکەین چ جوان باسی خیانەت دەکات «ژنی عاشق هەرکات خیانەت دەکات، خیانەتی جوانتر و پاکتر و ئینسانی ترە لە دڵسۆزیی ئەو ژنە بێهەست و درۆزنانەی بەسەر رۆژە مردووەکانی خۆیان و لە پاڵ جەستەی ساردی مێردەکانیان دەخەون» (١٦)، ئەمە ئەو قسەیەی کامۆم بیردەخاتەوە کە دەڵێ «تاوان بەرگی بەرائەت دەپۆشێ» (١٧) هەرچەند ئەو خیانەتەی باسکراوە تووشی دوودڵیت دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی بەراوردێکی هێناوە جۆرێک لە شەرعییەتی دەدەیتێ، وشەی خیانەت وشەیەکی نەرێیە، بەڵام بەوجۆرە مکیاجکراوە نەغەدەت خۆشبووێ، کە راستگۆیانە خیانەت دەکات، درۆ ناکات. گەر مرۆڤێکی عاشقی ئازادیت کردەکەی نەغەدەت لاپەسەندە لە هەندێ باردا، بەڵام بە پێچەوانەشەوە راستە کە ئازادی تا ئەو رادەیە بڕوات سنووورناس نەبێت، هۆکار بێت بۆ ئەزیەتدانی ئەویتر. لە رۆمانەکانی بەختیاردا بەردەوام کەسێتی دەبینیت، پڕە لە دوالیزمی، زۆر بەهێزە، بەڵام دژە مرۆڤە، زۆر رۆشنبیرە، بەڵام مرۆڤکوژە، دەنگی خۆش و ئارامبەخشە، بەڵام تاوانکار، جوانییەک لە رووخساردا و ناشیرینییەک لە ناخدا، جەمشید توانای فڕینی هەیە، بەڵام کێشەی بیرچوونەوەی هەیە، وەک لە رۆمانەکەدا هاتووە «هەموو مەخلوقە جوانەکان جۆرێک لە بێهێزییان تێدایە، کە هەرگیز جوانییان لە بێهێزییان جیانابێتەوە» (١٨).

کوبوونەوەی رق و خۆشەویستی، یان خۆشەویستی و رەحم... وەک بڵێیت لە نێو مرۆڤدا ئەم جیاوازی و دژانە هەبن، فریشتە و شەیتان هەبن، وەک چۆن لە رۆمانەکەدا هاتووە خاڵی لاوازی مرۆڤ جەستەیە نەک رۆح (١٩). لە رۆمانەکانی بەختیار هەست بە کەسێتیی سەیر دەکرێت، توانای سەرسوڕهێنەر هەیە لە کەسێتییەکاندا، بەڵام شتێ هەیە ئەو کەسانە دەستیان پێی ناگات، یان شتێ هەیە وەک رێگری، کەسێتییەکانی پەریسا و نەغەدە و شاعیرییەکەی و بولبولیار... بوونی هێز پێویستییە، هێز لە نێوان باشە و خراپەدایە، دەتوانرێت هێز هەبێت بۆ ئامانجی مرۆڤبوون بەکارهێنرێت، دەشێ بەپێچەوانەوە، ئەو هێزەی نزار و لیڤیتانت لە کام جۆر هێزەیە، ئەو هێزەن کە مرۆڤ خۆزگە دەخوازێت هەرچی هێزی وا هەیە تەفروتونا بێت، چونکە جگە لە خراپە هیچی دیی لێ بەرهەم نایەت، ئەو هێزەیە کە بە هێز شەرعییەت بە خۆی دەدات هەموو کارێ بکات، واتە هێزێکە بۆ مافبەخۆدان، هێزە بۆ ئەوەی ئەوانی دی بکەیتە داردەست، هێزە بۆ ئەوەی ئەوانی دی کۆنترۆڵ بکەیت نەک خۆ کۆنترۆڵ بکەیت، نزار هێزی هەیە





بۆ شکاندنی حەرامەکان، ئەمە کارێکی جوانە، بەڵام هێزیشی هەیە بۆ کوشتنی مرۆڤەکان کە ئەم کارەش حەرامە، هێزیان نییە بۆ دەرکردنی مرۆڤ لە نەهامەتی و کۆیلایەتی.

وشەی شۆڕش و شۆڕشگێڕ لەو وشانەن کە زیاد لە چەند شوێنی رۆمانەکە تانەی لێ دراوە و سەرزەنشتکراوە، بەڵام لە هەندێ دۆخدا بە پێچەوانەوە شۆڕش و شۆڕشگێڕ دەبنە پێویستی و دەبنە وشەی جوان، بۆ نموونە بولبولیار وەک شۆڕشگێڕ. دەشێ رۆماننووس بە مەبەست و هۆشیارانە ئەم دژانە کۆبکاتەوە، چونکە مرۆڤیش هیچ نییە جگە لەم دژێتییە، پڕیەتی لە ناکۆکی و دوالیزمی، کە هەرجارەو دەمامکێک دەپۆشێ جارێ وەک فریشتە و جارێ وەک ئەهریمەن، جارێ وەک شۆڕشگێڕ جارێ وەک خائین، توانای رۆڵبینینی مرۆڤ لەنێو هونەر و شانۆدا بینینی چەندین دەوری جیاواز و نمایشکردن و پۆشینی چەندین بەرگی جودا تەنیا لە مرۆڤ دەوەشێتەوە، چونکە بەڕاستی مرۆڤ خۆی بەو جۆرەیە، مرۆڤ دەتوانێ بەپێی شوێنەکان دۆخ وەرگرێت، کاتێ لەگەڵ رۆشنبیراندا دەدوێ وەک رۆشنبیر دەدوێت، کاتێ لەگەڵ سەوزەفرۆشێکدایە وەک ئەو قسە دەکات، لەبەر ئەوە کۆبوونەوەی دژەکان رەنگدانەوەی خودی مرۆڤەکان خۆیانە، هاوکات لەم رۆمانە و زۆرێک لە رۆمانەکانی تری بەختیاردا شتێکی گرنگ هەیە ئەویش فرەناویی کەسێتییەکانە، هەر کەسێتییەک چەندین ناوی هەیە، بەپێی شوێن و رۆڵەکانی ناوی پێ دەبەخشرێت، ئەم فرە ناسنامەییە وا دەکات لێکدانەوەمان بۆ کەسێتییەکان سادە نەبێت، چونکە فرەناوی جارێکی تر دوالیزمی کەسێتییەکان دەردەخات، هاوکات پێشمان دەڵێت ئەم کەسێتییە کەسێتییەکی ئاڵۆزە، وەک چۆن خودا چەندین ناوی هەیە و مرۆڤ ناتوانێ بڵێ ئەمە خودایە، ئاواش مرۆڤەکان بەهۆی فرەناوی و فرەناسنامەییەوە ئاڵۆزن، هەرجارە و بە ناسنامەیەکەوە دادەبەزن، ناسنامەکانیش جۆرێک لە ڕووپۆشن بۆ کردەکان، چونکە لەنێو ئەو فرە ناسنامەییەدا جارێ وەک شۆڕشگێڕ و مرۆڤدۆست، جارێ وەک بازرگان، خائین و جاسوس… واتە ناتوانین بڵێین نەغەدە شاعیرە و بەس، ناشتوانین بڵێین وەفا شۆڕشگێڕە، ئەمە بۆ هەموو کەسێتییەکان راستە، هەروەک لەنێو واقعی کوردیشدا ئەم فرەناسنامەییە باش دەبینرێت، کاتێ یادی کەسێتییەک دەکرێتەوە.

## شۆڕش وەک بەهانەیەک بۆ مردن

مردن سیحری خۆی هەیە، لەبەر ئەوەی مردن دەتوانرێ لەتلەت بکرێت و بەشبەش بکرێ، دەشێ بەشێکمان زیندوو و بەشێکمان مردووبێت، بە رۆح زیندوو بە جەستە مردوو یان بە پێچەوانەوە، یان وەک لەم رۆمانەدا هاتووە فریشتەکانمان دەمرن بێ ئەوەی هەستیان پێ بکەین، زۆرێک لە ئێستادا ویژدانی مردووە، بەڵام تا ئێستا نازانێ ویژدان هەیە یان نا. دەتوانرێ مردن بخوازرێ، لەوەی کە خۆت رزگاربکەیت لەم ژیانە خۆت بکەیتە قوربانی، یان خۆت بکوژی، وەک چۆن زۆر کەس لەژێر ئازاردا مردن دەخوازن، بەرگەی ئازارەکە ناگرن.
مردن دەتوانرێ بدرێ و ببەخشرێ، وەک چۆن بەعسییەکان مردنیان بە کورد دەدا (٢٠) ئەوهاش کوردەکان لەم رۆمانەدا بە نێوی شۆڕشەوە مردن دەدەنە ئەم و ئەو، شۆڕشگێڕەکان مردن دەدەنە

کەسانێک کە خۆیان داوایان نەکردووە، ئەوان لە ترسی ئەوەی نەمرن مردن دەبەخشن، مردن ناتوانرێ ببەزێنرێت، بەڵام زۆر کەس بە حسابی خۆیان لە مردن هەڵدێن و خۆیان دەکوژن، وەلێ مردن شتێ نییە لێی هەڵبێیت، ناتوانین مردن ببەزێنین، مردن دەتوانێ هۆکارێ بێت بۆ بەدەستهێنان، دەشێ هۆکاربێت بۆ دۆڕاندن، ئەوەی من دەترسم دەدۆڕێم، ئەوەی ناترسم دەبەمەوە. هاوکات تێڕوانینەکان بۆ مردن فرەن، بۆ نموونە مردن شتێ خودییە یان نا، دنیابینیی مرۆڤ بۆ مردن دنیابینیی بۆ ژیان دەردەخات، هۆشیاریی تاک دەردەخات کە تا چەند هۆشیارە بەوەی مردن خودییە و تەنیا یەکێکە لە ئەزموونەکان کە تاک بە تەنیا خۆی ئەزموونی دەکات، ئەم دنیابینییە دەری دەخات کە خاوەنی دنیابینییەکە کەسێکی ئازادە. مردن هێمای زۆرە، زۆر شت وامان لێ دەکات مردوو لە زیندوو جیاکەینەوە، لە ڕەنگ و دەنگی مرۆڤەوە دەتوانین ڕادەی ژیاندۆستی یان مەرگدۆستیی بزانین، هاوکات دەزانین، مردن چ کاریگەرییەک لەسەر ڕووخسار و ناخی مرۆڤ دادەنێت. لەم ڕۆمانەدا، مرۆڤەکان زۆر شت بە بەها دەکەن بۆ ئەوەی بۆی بمرن، هەندێ شت نرخی زیاترە لە بوونیان، ئەمەش لە نێوان مەرگدۆستی و موقەدەسکردنی شتگەلێک زیاتر لە ژیان و بوونی مرۆڤەوەیە، لە ڕۆمانەکەدا هاتووە «مردنم پێ باشترە وەک لەوەی دایکی منداڵێک بم نەچۆتە بەر مەدرەسە» (٢١). مردن زۆرجار دەبێتە پەیامێک، گەر ژیان پەیامێک بێت بۆ خۆمان ئەوا مردن پەیامێکە بۆ ئەوان. لەلایەکی ترەوە کوشتن هێرشکردنە سەر ژیانێکە، کە ئێمە خاوەنی نین، هەڵکوتانە سەر بوونێکە، کە ئێمە نەمانبەخشیوە.

تەنانەت خۆکوشتنیش تاوانێکە لە ژیان دەکرێت، ئێمە کە خۆمان دەکوژین یان دەکوژێن، پێمان وایە بەوە شتەکان بەکۆتا دەگەن، بەڵام بە پێچەوانەوە لە پاش ئەوە گرفتەکان و برینەکان قوڵتر دەبن.

مردن و یادەوەری دوانەیەکی لێکدانەبڕاون، لەم ڕۆمانەدا باسی ئەو نزیکییە کراوە، «ئەوەی لە مردووەکاندا رقم لێیەتی ئەوەیە هەندێکیان زۆر بە یادەوەرییەوە دەنووسێن» (٢٢) بەو پێیەی مردن تاکە ڕووداوێکە یەکجار بە ڕاستی لە ژیانی هەموو مرۆڤێکدا ڕوودەدات، ئەوا کاریگەریی خۆی هەیە، وەک چۆن جیابوونەوەی ڕۆح لە جەستە گرانە، بەهەمانشێوە جیابوونەوەی ئەو مرۆڤە لە هاوڵەکانی گرانە، لە ئاینیشدا هاتووە کە ڕۆح ئاسان لە جەستە جیانابێتەوە، چونکە سەردەمێک پێکەوە بوون، مرۆڤەکانیش بە ئاسانی لە یەکدی جودانابنەوە، بەتایبەت کە وێنە لە یادگەی ئێمە خەزن دەبێت، هەر مرۆڤێکیش بێ ئەندازە وێنەی هەیە، هەر کردەیەکی ژیان وێنەیە، ئەم وێنانە هەمووی لای دۆستانی خەزنە، کاتێ بەجێمان دێڵێ ئەم وێنانە زیندوون لە یادگەماندا، خۆیان مردوون بەڵام یادەوەرییەکان لەگەڵمان دەژین، تەنانەت دیتنی یەکجار بەسە بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤەت بیرنەچێتەوە، کاتێ مرۆڤێک دەکوژرێت بکوژ گەر ڕانەهاتبێ بە کوشتن، ئەوا ئەستەمە تا کۆتایی ژیانی کوژراوەکەی بیربچێتەوە.

یادەوەری بۆ ژیانەوەی مردووەکەیە، ئیدی ئەم ژیاندنەوەیە دەشێ مردووەکە بکرێتە کالایەک یان بە پێچەوانەوە، بۆیە مەبەستی ژیاندنەوەی مردووەکە بەپێی کەسە زیندووەکان دەگۆڕێت، کە چیی لە مردووەکە دەوێت. لە کۆندا یادەوەری بووبووە شتێ وەک مانەوە و نەمری و پیرۆزی





بەخشین بە مردووەکە، کە خەونیان بە کەسەکەوە دەبینی هەستیان نەدەکرد مردووە. بەختیار عەلی خۆی زۆر ورد لە کتێبی چێژی مەرگدۆستی (٢٣) باسی ئەم بابەتەی کردووە.

لە شوێنێکی تری رۆمانەکەدا هاتووە «هەرچییەکم کردووە دەبوو نەهێڵم بمرێت، چەندین شتی گرنگ و گەورە بەوەوە گرێدرابوون... ئەوکات نەمدەزانی کە مانەوەی بولبولیار هەتا لەوەش گرنگترە کە من دەرکیدەکەم». مردن کۆتایی هاتنە بە بوونی مرۆڤ لەم ژیانە، ئەوەی لەگەڵی دەژیاین چیتر ناتوانین لەگەڵی بژین، مەگەر لە خەوندا یان یادکردنەوەی. لێرە بە جۆرێ باسی بولبولیار کراوە وەک ئەوەی بچێت بۆ شوێنێک و رێی لێ بگیرێت، مردن تاکە شتێکە ناتوانین بەری پێ بگرین، وەک چۆن مرۆڤ دەسەڵاتی نییە نەخۆش نەبێ، دەسەڵاتی مردن وەک دەسەڵاتی خوایە، دێت و خۆی دەسەپێنێت، هاوکات ئەوەش درکدەکەین وەک ئەوەی بولبولیار کاڵایەک بێت و پێویست بێت مانەوەی، بەڵام شتێکی گرنگتر هەیە، مرۆڤ کە دەمرێت بە تەنیا خۆی ناڕوات زۆر شتی دی دەبات لەگەڵ خۆی، زۆر نهێنیی تر، مردن کە خۆی نهێنییە هاوکات نهێنیپارێزەو نهێنیبەریشە. بولبولیار نهێنییەکی لابوو بۆیە وەفا دەیویست زیندوو بێت.

بایەخی مردن کەمتر نییە لە بایەخی ژیان، بگرە هەردووکیان توند لێکئاڵاون، چونکە تا نەژین، نامرین، ئەوەی دەژی، دەمرێت، بوونی ژیان پێشمەرجە بۆ مردن، ئەم بایەخ بەخشینە بە یەکتر لێرەدا خۆی دەردەخات، کە مرۆڤ دەزانێت بۆچی دەژی؟ بۆچی دەمرێت؟ لە پێناوی چیدا دەمرێت و بمرێت؟ پرسیاری بۆچی لەکردەیەکەوە دروستدەبێت کە یان رابردووە یان داهاتووە، بۆچی دەڕۆیت؟ بۆچی وادەکەیت؟ بۆچی دەژیت، وەڵامەکەی پێیەکی لە نێوان رابردووە پێیەکی لە داهاتوودایە، هاوکات پرسی بۆچی دەمریت تەواو پەیوەستە بە داهاتووەوە، بەڵام ئەمە لەو شوێنەدا نامێنێ کاتێ وا لەو پرسە تێدەگەین کە مردن بۆ هەیە، واتە پرسیارەکە بکەینە پرسیارێکی جەوهەری، ئایا شیاوە مردن هەبێ، ئێمە بمرین؟ لێرەدا پرسیار و وەڵامەکەش جیاوازە، چونکە پرسیارەکە هەم فیزیکییە هەم میتایی، چونکە ئەژین ئەوا دەبێ بمرین، بەڵام کێ وای کردووە ژیان پەیوەست بێ بە مردنەوە، بۆ بە ژیانکردن مردن شیاو دەبێت؟ هاوکات ویستێک هەیە، ئامانجێک هەیە، بەهایەک هەیە، هۆشیارییەک هەیە، ناتەوێت بمریت و بەڵام نەزانی بۆچی دەمریت و لە پێناو چیدا دەمریت. لە رۆمانەکەدا هاتووە کە لە نیگای بولبویار دیاربوو کە «دەزانێت بۆچی دەمرێت» (٢٤) مرۆڤ هەمیشە شەیدای زانین بووە، زانین بۆی غەریزە بووە، زۆر مرۆڤ هەن نایانەوێت شتەکان لە ژیانیان رووبدات گەر رووشی دا بێ ئەوەی بزانن بۆ روویان دا، یان رۆڵیان نەبێ لە روودانی لە پێناو چیدا بمریت و ئەو شتەی بۆی دەمریت لێرەدا ئامادەیی هەیە.

مرۆڤ بەردەوام بیری لەوە کردووەتەوە مردنیشی بەهای هەبێ، مردنێکی سەربەرزانە بمرێ، خزم و کەسوکاری لە روویان بێت بڵێن بە چی مرد، بۆچی مرد، لە لاپەڕە ٥٢دا هاتووە «شۆڕشگێڕە گەمژەکان کە دێن بۆ ئەوەی بمرن» (٢٥)، بەواتا شۆڕش دەکەنە بیانوو بۆ ئەوەی بۆی بمرن، واتە بەهای شۆڕش هێندە بەرزە، کە بۆی بمریت، خۆت فیداکەیت، شۆڕش وا وێناکراوە کە نەمری

دەبەخشێ، بیرم دێ کاتی خۆی کتێبی ئەزموونی شێرکۆ بێکەسم خوێندەوە، باسی ئەوە دەکات، پێشمەرگە هەبووە ئاواتی خواستووە بمرێ تا شێرکۆ شیعری بۆ بنووسێ، ئاواتێکی سەیرە! شیعر بێبەها ناکەم، بەڵام ئەمەش بێبەهایی ژیانە.
نزار دەڵێ شۆڕشگێڕ دەبێ بکوژێت بۆ ئەوەی دواهەمین کەس بێت بمرێت. ئەم ویستە لە نزاردا زۆر مەترسیدارە، ئەم خود ئەڤینییە وا لە نزار دەکات هیچ پرەنسیپ و ئەخلاقێک بەجدی نەگرێ تەنانەت خودی ژیانیش، هەر شتێ مەترسی بێ بۆ بوونی ئەوە شایەنی لەناوبردن بێ، ئەم روانینە رەنگە لای زۆر مرۆڤ هەبێ، بەڵام دەربڕینی رەنگە ئاسان نەبێت، دەنا لە نیهانی زۆر مرۆڤدا هەیە.
لە رۆمانەکە هاتووە، هەموو مرۆڤێک کە بڕیاری کوشتنی دەدرێ، تا ئەوساتەی دواهەناسە دەدات چاوەڕوانی موعجیزەیەکە رزگاری بکات، کاتێ دەیانەوێت بولبولیار و هاوڕێکەی بکوژن، لە چاوی هۆشەنگ ئەم چاوەڕوانییە نابینرێ، هۆکەی دەگەڕێنێتەوە کە زۆر بە ژیانەوە نەبەستراوەتەوە.. بەڵام دەشێ هۆکەی ئەوەبێت لە قوڵایی مرۆڤدا ئاگادارکەرەوەیەک هەبێ بەتایبەت لەو مرۆڤانەی وەک بولبولیارن و مەلەکبینن، لەوەی کە کاتی مردنیان هاتووە یان نا، مردنیش لەنێو کاتدا رووئەدات، وەک چۆن هاوڕێکەی گوێی لە دەنگی مردن دەبێت. لەوەش تێدەگەین کە مردن دەنگی هەیە.
«یەکێک لە باشییەکانی مردن ئەوەیە، ئیتر کەس دەرگات لەسەر داناخات» (٢٦)، لە ژیاندابوون بەرکەوتنە لەگەڵ ئەوانی دی و کاریگەری و هێزی ئەوانە لەسەر تۆ، ئەوان دەتوانن زۆر شت بەرامبەر بە تۆ بکەن، تۆش بۆ ئەوان بەوجۆرەی، بەڵام ئەوان بەردەوام هێزێکی توندیان هەیە بۆ داگیرکردنی تاک. لە مردندا ئەوە نامێنێ، ئیدی ئەوان دەسەڵاتیان بەسەرتدا نامێنێ، باشیی مردن ئەوەیە لە کۆیلایەتی و زیندان رزگارت دەکات، زۆر کات ئاواتخواستن بۆ مردن دێتە ئاراوە لەبەر ئەوە مرۆڤ لە دۆخێکدایە کە مردنی باشترە لە ژیانی، ژیانی هەموو دەقەیەک مردنێکە بۆی، بەڵام مردنەکە یەکجارە و نەجاتی دەبێت، لەم دەربڕاوەدا ئەوە هاتووە کە مردی ئیدی کەس نییە دەستخاتە ژیانتەوە و داگیرت بکات، مردن ئازادبوونە، بەڵام ئایا ئازادی لە مردندا بەهای هەیە؟ ئێمە کە ئازاد نین مردن رەتکەینەوە، بەڵام کە مردین ئیدی ئازادی چ بەهایەکی هەیە بۆ ئەوانەی کە پێیان وایە تەنیا ئەم ژیانە هەیە؟ ئایا بۆ ئەوەی ئازادبین دەبێ بمرین؟.
لە شوێنێکی رۆمانەکە هاتووە کە مردووەکان هەرگیز بە تەنیا نامرن، بەڵکو هەموو مردوویەک بە جۆرێک هەموومان لەگەڵ خۆی دەکوژێت، یان مردن وەک تۆپێک وایە هێڵی گۆڵەکە دەبڕێت، بەڵام ئەوەی هەست بە گۆڵەکە دەکات تۆپەکەیە یان ئێمە؟ واتە ئەو کەسەی دەمرێت خۆی هەست بە هیچ ناکات، بەڵکو لەگەڵ خۆیدا ئێمەش دەکوژێ (٢٧).
مردن شتێکی خودییە ئەوەی بەختیار باسی دەکات هەستەکانە، بەڵام ئایا ئەزموونە راستەقینەکەی مەرگ هی کێیە؟ بێگومان هی کەسە مردووەکەیە، مردن تاکە شتێکە وەک ئەو پەپوولەیە وایە کە لە ئەفسانەیەکی هیندیدا هاتووە، پەپوولەکە بۆ ئەوەی حەقیقەتی مردنی بۆ دەرکەوێت هێند لێی نزیک دەبێتەوە تا دەسوتێت، ئەو کاتەی دەسوتێت



چیتر توانای گێڕانەوەی حەقیقەتەکەی نییە، بەڵام ئەوەی لە مردنیش تێگەیشتووە خۆیەتی نەک ئێمە، ئێمە لە دەرەوەی یارییەکەین، وەک ئەوەی بینەری یارییەکەبین لە دەرەوە بزانین چی ڕوودەدات، بەڵام نازانین لە ناوەوە چی دەگوزەرێ، ئێمەی بینەری مردووەکان زۆرکات بینینەکە وەک بەختیار دەڵێت ئەوەمان بیردەخاتەوە کە ئێمەش دەمرین و بۆشاییەک جێدەهێڵین، چونکە مرۆڤەکان کە دەژین بۆشاییەک پڕدەکەنەوە لە شوێندا، کە دەمرن ئیدی ئەو شوێنە بۆش دەبێت، هاوکات مردن وەک ئەوەیە کە هەموومان مردبین، لەگەڵ خۆی هەموومان ببات یان ئەمە تەنیا سیمبوولێکە بۆ ئەو هەستەی کە لەو دۆخەدا تێی دەکەوین؟ لەلایەکی ترەوە ئەوە ئێمەین هەست بە مردووەکە دەکەین، نەک خۆی، ئەوە ئێمەین داخلەدڵین بۆ مردنی ئەو، ئەو چیتر بێخەبەرە لەمانە، لای ئەو وەک ئەوەیە ئێمەش هەموو مردبین، چون ئیدی هەستمان پێ ناکات، ئەوەی وادەکات کەسێک زیندووبێت لامان ئەوەیە هەستی پێ بکەین، بەڵام کەسی مردوو هەست بە ئێمە ناکات، بەڵام ئێمە هەست بە مردووەکە و وێنە و یادەوەرییە بەجێماوەکانی دەکەین. (لە دیدی ئاینیدا ئەمە جیاوازە). ڕەنگە پەیوەست بە مردووەکەوە ئەوە ئێمەین مردووین نەک ئەو، هاوکات پاش مردنی کەسەکە زۆرکات ئێمەی بەحساب زیندوو (چونکە هەندێ ڕوانین هەیە مردوو بە زیندوو دادەنێ، بە پێچەوانەوە) خەون بە مردووەکەوە دەبینین، قسەی لەگەڵ دەکەین، ئێمە هەواڵی ئێرەی دەدەینێ و بە پێچەوانەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدایە ئێمە نەمانتوانیوە بە چاوی سەر پاش مردن ببینین، واتە بزانین ئایا دەژین لە پاش مردن؟ بەڵام کەسی مردوو ژیانی سەر زەوی ژیاوە، بەواتا کاتێ ئێمە لە خەوندا دەیبینین، گەر ئەو زیندوو بێ بۆ ئەو ئاسانە لە ژیانی ئێمە حاڵیبێ، بەڵام بۆ ئێمە سەختە لە ژیانی پاش مردنی ئەو تێبگەین، ئەمە لەکاتێکدا گەر پاش مردن ژیان هەبێ. بەڵام مردوو زۆرکات بۆ ئەوەی زیندوویەتیی خۆی بپارێزێ (لەم ژیانەدا) کۆمەڵێ ڕێگە دەگرێتە بەر، تەنانەت زیندووەکانیش بۆ زیندووهێشتنەوە کۆمەڵێ ڕێوشوێن دەگرن، لەوانە نووسینی وەسیەت و چلەی ماتەمینی... هاوکات مردن هەمیشە مامۆستا بووە بۆ وانە وەرگرتنی زیندووەکان. بەڵام لێرە ئەو پرسیارەش بکەین، ئایا گەر پاش مردن ژیانێکی دی نەبێ چۆن مرۆڤەکان ئەم هەموو شتە لە پاش خۆیان بەجێدێڵن بۆ ئەوەی پاش مردنیان بە باشە باسکرێن، دەچین بۆ پرسە بۆ لای نەخۆش، بۆ گۆڕستان بۆ ئەوەی کە ئێمەش مردین پرسەکەمان چۆڵ نەبێ، گۆڕەکەمان سەردانی بکرێت...؟ گەر بەپێی بەختیار بێ کە بە مردنمان هەمووان دەکوژین، ئەی بۆ وەسیەت دەکەین؟ بۆ دەمانەوێ پاش مردن بژین؟ من پێم وایە کە دەشمرین ئومێدی ژیان بوونی هەیە، ئیدی ژیانی سەر زەوی بێ یان ژیانێکی دی.

«هەر کەسێک ئامادەنەبێت بۆ مردن و کوشتن لای من پێشمەرگە نییە» (٢٨) ئامادەبوون بۆ مردن، گرنگە مرۆڤ وەک مۆتەکە سەیری مردن نەکات، ئەوەندە لە مردن نەترسێ نەتوانێ بژی، هاوکات ئەوەش مەترسیدارە کە بەهای ژیانی لا نەبێت و مردن بە شتێکی ئاسان بزانێت، مردن بردنی ژیانمانە، ئەو ژیانەی لە سەرەتاوە کۆششدەکەین خۆشی بکەین، مردن لە ماوەیەکی کەمدا دەیبات، ئەو ماڵەی ژیان

پێمانی بنیاد دەنێ مردن دەیڕوخێنێ. ڕەنجی چەند ساڵە بەساتێ دەڕوات، لەبەر ئەوە ئامادەیی بۆ مردن هەم پێویستە و هەم مەترسیدارە گەر لەسەر بێنرخکردنی ژیان وەستابێت. لەم دێڕەدا هەست بەو بێنرخییە دەکەین، هەست دەکەین شتێک هەیە نرخی زیاترە لە ژیان، بەڵام پێشمەرگە ناوی خۆی بەخۆیەوەیەتی کە پێش مەرگ کەوتووە، بگرە وەک ڕێنمایکەری مەرگ وایە، مادام شۆڕش داوا لە پێشمەرگە دەکات بمرێت و بکوژێت دەبێت بیکات، دەنا پێشمەرگە نییە. بوون بە پێشمەرگەش هەڵوێستێک و کارێکە، ئامانجێک لەپشتیەوەیەتی، بەڵام پێشمەرگە لەم ڕۆمانەدا، چونکە دیلی شۆڕشە و شۆڕشیش لەسەر ئامادەیی بۆ کوشتن و مردن وەستاوە ئەوە دیدێکی خراپ بەرامبەری هەیە، بێ نرخ سەیرکردنی ژیانی خۆت بێ نرخ سەیرکردنی ژیانی ئەوانە، ئامادەیی بۆ مردن و کوشتن، بریتییە لەوەی کە ژیانی خۆت و ژیانی ئەویتر بەدەستی تۆ بن، سەیرە مرۆڤ چۆن ئەو مافە بەخۆی دەدات دەست لە ژیانێکەوە بدات کە هی خۆی نییە. مرۆڤ چونکە بەتەنیا ناژی لەبەر ئەوە خودکوژیش سنوربەزاندنی ئەویدیی تیایە، چونکە هەرهیچ نەبێ سنوری ژیان و ماناکانی دەبەزێنیت (٢٩).

کاتێک بەشێک لە مرۆڤ دەمرێت ئیدی زیانی گەورە لە تەواوی بوونی مرۆڤ دەدات، بۆ نموونە کەسێک کە پێی دەگوترێت دەم مردوو، شتێک لەناو ئەو مرۆڤەدا مردووە کە کەلێنێکە، بەڵام کاتێ مرۆڤێک ویژدانی دەمرێت، ئیدی ئەو مرۆڤە زۆر شتی لێ دەمرێت. لەم ڕۆمانەدا باسی مردنی فریشتەکان کراوە، کە هەوڵێکی زۆر دەدرا پارێزگاری لە فریشتەکان بکرێت، ئێستا هەست دەکەین فریشتەکان مردون، چونکە ڕاهاتووین بێ فریشتە بژین، لەبەر ئەوەشە ژیانی ئەمڕۆمان بەو هەموو خزمەت و بوونی ئەو هەموو شتانە ڕۆژانێ نەمانبوون ئێستا هەمانن، بەڵام هەر هەست بە کەلێن و ناخۆشیو بێزاری دەکەین، بێتاقەتین نازانین بۆ، هەر دادوبێدادمانە و توڕەین، کاتێ لەیەک دەپرسین شتی زۆر کەمبەها دەکەینە بیانوی بێتاقەتی و توڕەییەکەمان، یەکدی کوشتن و خۆکوشتن و ئاسانی مردن زۆر زیادی کردووە، تەنانەت مردن بووەتە ژمارە هۆکارگەلێک دەهێنینەوە کە بۆ پەردەپۆشکردنی هۆکارە بنەڕەتییەکەیە، ئەویش ئاوابوون و برینداربوون و مردنی فریشتەکانمانە. «ڕزگارکردنی مرۆڤ بەرزگارکردنی فریشتەکەی ناخییەوە بەندە... تا فریشتەیەک ڕۆژێک درەنگتر بمرێت، کارەساتە گەورەکان ڕۆژێک درەنگتر دێنە پێشێ... هەر فریشتەیەک کە دەمرێت، مردنی مانایەکی تایبەتی هەیە، مردنی نیشانەیە بۆ هەڵەیەکی گەورە لە ڕۆحی ئێمەی بەنیئادەمدا» (٣٠) مردنی فریشتەیەک مانای هەیە، بەڵێ چونکە مردنی ئەوان زەنگن بۆ مردنی خۆمان، مردن بەمانا ڕەمزییەکەی و وەک خۆییەکەی، چونکە مردنی فریشتەکان مردنی بەهاکان و مردنی ئازادی و ئەخلاق و ژیانمانە، هەرکات ژیانیش بەهای نەما ئیدی کوشتن و خۆکوشتن زیادەدەبێت (وەک لە ئێستادا دەبینرێت).

لە ڕۆمانەکەدا نووسراوە فریشتەکان مرۆڤن، ئەمە ڕاستە، چونکە ئەوەی مرۆڤبوونی مرۆڤ دەپارێزێ، ژیان جوان دەکات ئەوانن، هەتا بوونی فریشتەکان لاواز بێ، جوانی لاواز دەبێ، مردنی فریشتەکان پڕ مانان، چونکە مردنی هەریەکەیان گەر پەیامێکی





گەورە و گشتی پێ نەبێت بۆ گشت مرۆڤایەتی ئەوا پەیامێکی تایبەتی پێیە، مردنی فریشتەکان و ئەو بارە خراپەی بەسەر لانەی فریشتەکان و کەشتی فریشتەکاندا هات لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا نیشانەیەکی زەق و پەیامێکی روونە بۆ کورد، کە کەلێن لە ڕۆحماندا دروستبووە و قوڵتریش دەبێتەوە، بەو بێباکییەی بۆ مردنی فریشتەکان هەمانە دۆزەخی ژیانمان لەسەر خۆمان داگیرسان. مردنی فریشتەکان لەناو مرۆڤدا ڕێگە بۆ داگیرسانی جەلادەکەی ناومان دەکاتەوە، ئیدی بوونە جەلاد بۆ یەکتری، لەنێوان بکوژ و کوژراو، لەنێوان جەلاد و قوربانیدا دێین و دەژین، مرۆڤی ئێستا لەو دۆخەدا دەژی، کاتێ سوکانی ئۆتۆمبێلەکەی بەدەستەوەیە وەک ئەوەیە چەقۆیەکی پێ بێ، چونکە هەمیشە ئەگەری بوونە جەلاد نزیکە، ئەو رووداوانەی هەنوکە رووئەدەن هیچ نین جگە لە ئاماژە بۆ ژیانکردن لە ڕۆژگارێکدا کە فریشتەکان مردوون، فریشتەکانمان ناژین.

ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت ئایا مردنەکەی خۆی هەڵیبژاردووە؟ ئایا ئێمە دەتوانین مردنێکی خۆویستانە بمرین، مردن دەکرێت بە ویستی خۆمان بێت؟ ئایا جیاوازیی مردنی ئێمە و فریشتەکان چییە؟ لە ڕۆماکەدا باس لەوە کراوە «مردنت نابێت مردنێکی خۆویست بێت... نابێت مردنی هیچ فریشتەیەک مردنێکی ئازاد بێت... فریشتە کاتێ فریشتەیە کە بکوژرێت نەک خودکوژی بکات» (٣١) مردنی خۆویستانە لە راستیدا بوونی نییە، ئەوەی هەیە چۆنیەتیی مردنەکەیە گەر ئەمیش کەسانی تایبەت بتوانن ئەوە هەڵبژێرن، دەنا مردن شتێ ناچارییە، دەتوانیت خۆکوژی بکەیت، بەڵام ناتوانیت لە مردن راکەیت، دەتوانیت مردن پێشخەیت، بەڵام ناتوانیت لێی یاخی بیت. مردن چ بۆ مرۆڤ چ بۆ فریشتە یەکێکە لەو رووداوانەی کە ئازادیمان نییە بەرامبەری، بەڵام دەتوانین ئازاد بین لەوەی نەبینە شۆڕشگێڕ. جیاوازیی مردنی مرۆڤ لەگەڵ مردنی فریشتە بە ریشەیی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مردنێکە یەکتری تەواو دەکەن، بەڵام ئەوەی توانای کوشتنی هەیە مرۆڤەکانن، مرۆڤەکان دەتوانن فریشتەکانیان بکوژن، دەشتوانن پارێزگاریی لێ بکەن، بەڵام کوشتنی فریشتەکان مرۆڤ دەکاتە جەلاد، جەلادێک یەکەم کردەی بە کوشتنی فریشتەکەی دەست پێدەکات. مردنی مرۆڤ تا رادەیەک کەمتر لەژێر دەسەڵاتی فریشتەدایە، فریشتە تەنیا دەبێتە هۆ. فریشتەکان دەکوژرێن لەلایەن مرۆڤەکانەوە، بەڵام مرۆڤ مەرج نییە بکوژرێت دەشێ بمرێ، چونکە کوشتن دەبێ کەسێ بتکوژێ بکەرێکی دیار هەبێ، هەرچەند زۆرکات ئەو بکەرە مرۆڤ نییە دەشێ ئامێر یان نەخۆشی و دووریی ئازیزێک بێت، بەڵام مردن راستەوخۆ دەسەڵاتی مردن خۆیەتی دەردەکەێت.

«جەهەنەم ئەو جێگایەیە کە مردنی تێدا نییە» ئەمە وەفا دەیڵێت، مەبەستی جەهەنەم شتێکی میتافیزیکی نییە، بەڵکو مەبەستی ئەم ژیانەیە کاتێ دەبێتە جەهەنەم، ئیدی مردن پێویستییە، بەڵام وەک بڵێی دۆستایەتییەک و رێککەوتنێ هەبێ لە نێوان جەهەنەم و مردندا بۆ ئازاردانی مرۆڤ، ئەوکاتەی کە خواخوامانە (ویستی مردن زاڵە) مردن بێ نایەت، یان ئێمە کاتێ لە ئازاردا دەژین، لەبەر ئەوەی کەم خۆگرین دەمانەوێ بەهەر نرخێ بووە رزگارمان بێت، چونکە ساتەکانی ئازار

درێژدەبنەوەو نارۆن، هاوکات دەشێ مەبەست ئەوەبێ کە جەهەنەم خۆی مردنە، یان جەهەنەم ئەو شوێنە خۆشەییە کە مردنی لێ نییە، واتە پەسنەکە دەشێ ئەرێنی بێ دەشێ نەرێنی. ئەمەوێ بڵێم مردن هێند ئازاری نییە، بۆیە زۆر مرۆڤ لە ژیاندا داوای مردن دەکەن، بەڵام ئەم داواکردنەش زۆرکات لە دڵەوە نییە، بەڵکو بۆ رزگاربوونە لە شتێ نەک ئەوەی خودی ژیان وای کردبێ ئەم داوایە بکەیت، بۆیە هەست دەکەم مردن دەزانێ کە ئێمە لەژێر ئازارێکدا داوای دەکەین بۆیە نایەت، وەک چۆن لە رۆمانی دەریاوانە خنکاوەکەی مارکیز، کەسێتییەکە گیر دەخوات لە نێوراستی دەریاکە و داوای مەرگ دەکات، بیر لەوە دەکاتەوە چۆن خۆی مردنی خۆی هەڵبژێرێ چونکە چارەی نییە، لەو بیرو داڵغەیەدایە لەنێو دەریاوە هێرشی دەکرێتە سەر لەلایەن یەکێ گیانەوەرانی دەریاوە، رادەچڵەکێ و هەڵدێ، ئەو بیری دەکردەوە چۆن کۆتایی بەخۆی بێنێ ئەویش لەدەریاوە هات کۆتایی پێ بێنێ، بەڵام هەڵهات، بۆ؟ چونکە لە قوڵایدا خواستی ژیان هەیە، ناچاری وای لێدەکات حەز بە مەرگ بکات، یان ئەوەیە دەیەوێ بەو جۆرە بمرێ کە خۆی دەیەوێ، وەک چۆن رەگەزێکی مێ لە کۆمەڵگەی کوردی خیانەتێ بکات و پێی بزانرێ، چەندین خانم بەوجۆرە کۆتاییان بە خۆیان هێناوە و خۆیان سوتاندووە، چونکە هەستیان کردووە مانەوەیان ئازاری زیاترە، خۆیان وتەنی هەموو دەقەیەکیان مردنە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئەوان رقیان لە ژیان بێتەوە، یاخود دەشێ واش لەو دێرە تێبگەین کە هەرکات خواستی مردنمان هەبوو هۆکارگەلێ هەن بۆ مانەوەمان لەو عەزابە، چون مرۆڤەکان چێژ لەو ساتە وەردەگرن کە تۆ لە عەزابدایت، وەک لە رۆمانەکەدا هاتووە جەلاد حەزدەکات نێچیرەکەی چەندین جار بمرێت، تا حەزی لە کوشتن تێربێت، یان بۆشاییەکە پڕبێتەوە، بەڵام ئەو شوێنەی پێویستە مردنی لێ بێت لێی نییە.

## لە نێوان سەرنج و هەڵەدا

لە لاپەڕە ٧٨٧دا باس لەوە کراوە کە وەفا زیندانە لەو شوێنەی کە ئاوات دەخوازێت بمرێت، چونکە زیندانە لای هاوەڵانی شۆڕشی، لای شۆڕشگێڕان، زیندانە لەو باڵەخانەیەی کە چەندین شتی سەرسوڕهێنەری تیایە. شوێنێکی ئەو باڵەخانەیە کە وەفای بۆ دەبەن، ژوورێکە پڕاوپڕ رابردووی دەهێنێتەوە یاد، سەردەمانی خەباتی دەهێنێتەوە یاد. مرۆڤ بیری ئەوکاتانە دەکاتەوە، بەڵام پەشیمانە لێی نەک ئاخی بۆ هەڵکێشێ، بە تێگەیشتنی ئەوکاتەی پێویست بووە، بەڵام تێگەیشتنی ئێستا پێچەوانەکەیەتی، راستە بیری دەخاتەوە کە چۆن کردیان، بەڵام بە درێژایی رۆمانەکە تانەدانە لە شۆڕش و خەباتی شۆڕشگێڕان، بەڵام بەمجۆرە نووسراوە «راچڵەکیم و گریام. ئەم بۆنە دێرینە... بۆنی پاکی شۆڕش... بۆنی ئەو پێشمەرگە بچوکو بێنیازو غەمخۆر و سادانەی لەسەر شانی خۆیان درندەیەکی ترسناکیان گەورە کرد» (٣٤) لە رۆمانەکە بە دەگمەن بەر ئەوە دەکەوین کە شۆڕش جوان و پاک بێت، پێشمەرگە بەو وەسفەی ئێستای بێت، ئاشکرایە کە کەسانێکی دڵسۆز هەبوون بەو جۆرە سەیری شۆڕشیان کردووە، بەڵام ئەو کەسانە لەنێو رۆمانەکە بوونیان نیە.

لەلایەکی ترەوە ئەوەی رۆمانەکە بخوێنێتەوە





تێدەگات بولبولیار هەژارترینیە، لە چەندین شوێندا باسی ئەوە کراوە، پلەی باڵای بۆ دانراوە لە هەژاریدا «هەژارترین»، هاوکات بولبولیار پێویستی بەم هەژارییە بووە، واتە هەژاری بووەتە پێویستییەک بۆ مانەوەی بەو پاکییە، پێویستییەک بۆ پاراستنی فریشتەکەی توانای دیتنی فریشتە و بوون بە مەلەکبین. بولبولیار لەو ڕۆمانەدا لە چەندین شوێندا باسکراوە کە هەرگیز نایەوێت لە هەژاری دەرچێت، بەڵام لە لاپەڕە ١٦٥دا نووسراو «فریشتە دەتوانێت چیم بۆ بکات.... دەتوانێت یارمەتیم بدات دەوڵەمەندبم» (٣٥) ئەوە سەیرە لەلام کە داوای دەوڵەمەندی دەکات، جگە لەوەی بە چاوێکی بەرژەوەندی سەیری مەهدائیل دەکات، کە ئەمە کەمتر لەگەڵ سروشتی بولبولیار دێتەوە، هاوکات ئەو داوایەش لە دەرەوەی کەسێتی و خواستی ئەوە. هەروەک پێشتر نەهاتووە کە باسی ئەوە کرابێت بولبولیار توانای دیتنی فریشتەی هەیە و فریشتەی بینیوە، بینی مەهدائیل یەکەم فریشتەیە کە دەیبینێت، ئیتر بۆچی پێشتر فریشتەی وای نەبینیوە، چونکە ئەسڵەن ئەوە یەکەمجارە کەشتێ بەناوی فریشتەوە دەبینێ، هەرچەند دەشێ ئەوەش بگوترێت کە وێناکردن هەیە بۆ فریشتەکان. لەبەر ئەوە پێم وایە ئەو داوایەی بولبولیار نالۆژیکییە لەگەڵ کەسێتیی ئەو.

زمانی نووسین زۆر گرنگە، پێویستە وردکارانە بنووسین، ئەو وشانەی هەڵیان دەبژێرین دەبێ ئاگاداری بین، چونکە وشە وەک فیشەک وایە، دەشێ وەک ماچ وابێ، لە ڕێگەی زمانەوە بوونی خۆمان دەردەبڕین دەبێ زۆر وریابین، تەنانەت زمانی تەنزیش زمانێکی تایبەتە و نابێت بریندارکەر بێ، بەڵام لە ڕۆمانەکەدا بە وشەگەلێکی زۆر بازاڕی و ناشیرین باسی نوح پێغەمبەر بکرێت، کە لە لاپەڕە ٦٩٤دا باسکراوە. من خۆم نامەوێ جارێکی تر بینووسمەوە، چونکە ئەو جۆرە زمانە هەر جوان نییە، ئیدی بۆ هەرکەسێ بێت، من وەک خوێنەرێ پێی نائاسودە بووم، گەر دیندار و موسڵمانێ ئەو دەقە بخوێنێتەوە هەست بەچی دەکات؟ لەم ماوەیەدا ڕۆمانی نەوەکانی مادابیم خوێندەوە شتێکی جوانم بەدی کرد، ڕۆماننوس ڕێنمایی خوێنەری دەکرد، کە گەر کەسێکی هەستیارە با ئەم لاپەڕەیە یان ئەم بەشە نەخوێنێتەوە. ئەمە شتێ جوان و گرنگ و پێویستە کە نووسەر ئاگای لە هەستی بەرامبەر بێت و تەنانەت تۆی نووسەر کە وەک خوێنەر دەکەویت بەسەر ئەو دێڕەدا ئەو هەستەت لا دروست نابێ؟

لەلایەکی ترەوە بە بڕوای من دەکرا ڕۆمانەکە کوتتر بکرایەتەوە، لە هەندێ شوێندا من وەک خوێنەرێک تووشی مەلەل دەبووم، بە دروستی بڵێم مەبەست درێژدادڕییە، ڕاستە ڕۆمانەکە پڕ ڕووداوە، بەڵام دەشکرا ئەو ڕووداوانە بە کورتتر بنووسرێن، بێ بۆشایی بن و ڕووداوەکان تێربکرێن. لە زۆر شوێنی ڕۆمانەکە هەست بە نووسینی وتار دەکرێت لەسەر بابەتگەلی جودا، پەسنی درێژ زۆر تێدایە.

## تەکنیکی ڕۆمانەکە

لەم بەشەی نووسینەکەدا باسی تەکنیکی گێڕانەوە و هەندێ هونەری دی دەکەین کە لە ڕۆمانەکەدا هاتووە. ڕۆمانەکە کرانەوەیەکی تێدایە بە ڕووی خوێنەردا، لە چەند شوێنێکدا قسە لەگەڵ خوێنەر دەکرێت و پرسیاری لێ دەکرێت، وەک بڵێی خوێنەر

بەشداریی پێ بکات، چاوەڕوانییەکانی خوێنەر زیاد دەکات، خوێنەر لە کەسێکی خوێنەرەوە دەبێتە بڕیاردەر و بەشدارییپێکەر، ڕۆڵی دەبێت ئیدی ناتوانێ بێدەنگ بێ و تەنیا خوێنەرێکی دووری ڕووداوەکان بێ، دیارە ئەمەش گوزارشت لە بایەخدان بە خوێنەر و گرنگی خوێنەر دەکات، هاوکات لەکاتێکدا کە مەرگی ڕۆمان ڕاگەیەنرا، زۆر شێوازی نوێ داهێنرا تا ئەوەی ناوی مەرگی ڕۆمانە تێپەڕێنرێ، یەکێ لەو کارانە ئەمەبوو کە خوێنەر بەشداریی پێ بکرێ(٣٦) لە ڕۆمانەکەدا هاتووە «گەر بتوانن ئەم چیرۆکە تا کۆتایی بخوێننەوە، ڕەنگە ڕوونتر بزانن باس لەچی دەکەم» (٣٧) یان «کتێبتان لە قەسابخانەدا بنینوە؟...ڕۆژێکی سەیربوو کە تەواوی وردەکارییەکانیم لای خۆم پاراستووە، بەڵام ئێوە چ کارێکتان بە وردەکاریی ڕۆژی وەها هەیە» (٣٨). داوا لە خوێنەر دەکات تا کۆتایی لەگەڵی بڕوات تا نارونییەکان ڕوونبێتەوە بۆی، واتە گێڕەرەوە کە نووسەر خۆی دەگرێتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر ناچارکات لەتەکیدا بڕوات، بەڵام ڕۆشتنی گێڕانەوە نەک حەکایەت، حەکایەتەکە رابردووە، بەڵام گێڕانەوەکە ئێستایە بە کاتی نووسینەکە. لە شوێنێکی تردا چیرۆکی نووسینی کتێبەکە و مانەوەی هەندێ شت بە نهێنی. هاوکات هاندانێکی زۆری تێدایە کە گێڕانەوەکە خوێنەر ناچار دەکات بەدوای ڕووداوەکان بکەوێت، وەک چۆن کەسێ شتێکی لێ وندەبێت دەیەوێ بیدۆزێتەوە، هەر دەڕوات، بە هۆی گەڕان بەدوای ئەو شتەی مەبەستییەتی چەندین شتی تر دەبینێ، خوێنەری ڕۆمانەکەش بەمجۆرەیە، یان لە هەندێ شوێندا بە خوێنەر دەڵێت گەر تا کۆتایی ئەم چیرۆکە بڕۆیت ئەوە دەبێ یان لە ڕۆمانەکەدا هاتووە «لە ڕۆژان و ساڵانی داهاتوودا زۆر سەروکارم لەگەڵ ئەم دوو کەسە دەبێت» (٣٩).. ئەمە هەم تامەزرۆیی دروستدەکات هەم تەکنیکی پێشکەوتن و گەڕانەوەی تێدایە، کە لایەنی هونەری و جێژی خوێنەر زیاد دەکات، وەک بڵێیت ئەو کەسەی بەدوای شتە ونبووەکەی دەگەڕێت زانیاریی پێدرابێت، کە شتەکە لەوێیە، یان لە دوورەوە بریسەکەی شتێک ببینێ وابزانێ شتە ونبووەکەی خۆیەتی. مرۆڤ حەزی زانینی هەیە، هەروەک چۆن حەزدەکات نهێنییەکان ئاشکرابکات یان ئاشکرابکرێت بۆی نایەوێ کە نهێنی بوو بە نهێنی بمێنێتەوە، چونکە مانەوەی ئەو نهێنییە بێ ئاشکرابوون وەک دۆڕاندن وایە، ئەم ڕۆمانەش نهێنیسازکەرێکی گەورە دەیبات بەڕێوە، مرۆڤ لە سەرەتاوە تووشی نهێنیگەلێک دەبێت، سەرەداوێکی دەدرێتێ و ئیدی ونی دەکات تا خۆی بدۆزێتەوە، خۆدۆزینەوەکەش بە خوێندنەوەی تەواوی دەقەکە دەبێت، چونکە نهێنیی نزار و هەستی وەفا لەکاتی کوشتنی ئەسپەکان و پەیوەندیی نزار و لیڤیتانت، بینینی بولبولیار و ئەو نهێنییە بولبولیار درکی دەکات و وەفا لێی تێناگات، هەر ئەو نهێنییەش بولبولیار فریاد دەکات، چەندین نهێنیی تر کە لە نهێنیی کەشتییەکە و نەغەدە و... لەبەرئەوە ئێستا هەوڵ دەدەین باسی تەکنیکی گێڕانەوە کە بکەین.

تەکنیکی گێڕانەوەی ئەم دەقە، تەکنیکێکی ئاڵۆز و چڕ و تێکەڵە و جۆرێک لە تەمومژیی تێدایە، گەر ورد نەبین، ئاسان دەکەوینە هەڵەوە، وەک چۆن لە ڕۆمانی جەمشید خانیش هەست بەوە دەکرێت، وەک بڵێیت فێڵێک هەبێت نووسەر بیکات، چونکە جەمشید خان بە تەکنیکی سادە و کلاسیک



دەگێڕدرێتەوە، ئەوەی کە چیرۆکی هەبوو نەبووی پێ دەگێڕدرێتەوە، واتە تەکنیکی شوێنکەوتە (٤٠)، هاوکات تەکنیکی بازنەییشە لەوەی کە سەرەتای رۆمانەکە کۆتاییەکەیەتی.

ئەم رۆمانەش لەمە بەدەر نییە، بۆیە ئاسان نییە بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە سەر بە کام تەکنیکە، چونکە خەسڵەتەکانی چەند تەکنیکێک هەن لەم رۆمانەدا، خەسڵەتی تەکنیکی هاوسەنگ، تێهەڵکێش، هاوکات هەمان حاڵەت لەم رۆمانەشدا دەبینرێت، کە وادەکات بڵێین لە تەکنیکی بازنەی کراوە بێبەش نییە، بۆیە بنیادێکی ئاوێتەو ئاڵۆزی هەیە. دەبێ بشڵێین کە کاتی گێڕانەوە لەگەڵ کاتی حەکایەتەکە جیاوازە، بەڵام پەیوەندییەکی توندیشیان بەیەکەوە هەیە، کاتی گێڕانەوە ئەوکاتەیە کە گێڕانەوە تیایدا روودەدات، بەڵام کاتی حیکایەت ئەو کاتەیە کە رووداوەکانی تێدا روودەدات، رووداوێک ئێستا رووی داوە، بەڵام من ساڵێکی دی دەیکەمە دەقێک و دەیگێڕمەوە واتە کاتی گێڕانەوەکە دابڕاوە و داشنەبڕاوە لەکاتی حەکایەت، چونکە گێڕانەوەی حەکایەتەکەیە، بەڵام بە کاتی ئێستا کە دەقەکەی تیا نووسراوە، کە ساڵێک تێپەڕیوە بەسەر رووداوەکەدا. هاوکات پەیوەندیەیکی توند هەیە لە هەندێ شوێندا کات خێرا دەڕوات و لە هەندێ شوێنی دی کات خاو دەڕوات، یان کات لای کەسێتییەک بۆ کەسێتییەکی تر جیاوازە، بۆ نموونە کاتەکانی نێو زیندانی وەفا نارۆن، بەڵام ئەو سێ رۆژەی سەرەتای راپەڕین کە وەفاو نزار و دکتۆر شێرخان لەگەڵ ٤ ئافرەتەکە خەریکن، کات بۆ نزار و شێرخان زوو دەڕۆیشت، بەڵام وەک خوێنەرێک هەستم بەخاوبوونەوەی کات دەکرد بۆ وەفا، هەروەک کاتی ناوەکی و دەرەکیش هەیە، کە ئەمە زیاتر کاتێکی ناوەکییە بۆ وەفا. لەلایەکی ترەوە کاتی گێڕانەوە سەربەخۆیی تێدایە لەوەی، کە بە چەندین شێوە گێڕانەوە هەیە، لەبەر ئەوە رۆماننووس دەتوانێت کارامەیی خۆی لە گێڕانەوەدا دەربخات بەوەی کامە شێواز شیاوترینیانە، گرنگە جیاوازی بکەین لەنێوان کاتی گێڕانەوە و حەکایەت، جگە لەوەی کاتی خوێندنەوەش جیاوازە لەهەردووکیان، خوێنەری دەقەکە لە کاتێکی جیاواز دەیخوێنێتەوە، دیالۆگەکانی ئەفلاتون کەی کراون، کەی ئەفلاتون نووسیونی، تۆیش کەی دەیخوێنیتەوە.

### تەکنیکەکانی گێڕانەوە و تەکنیکی هاوسەنگ لەم رۆمانەدا

تەکنیکی هاوسەنگ بریتییە لە «گێڕانەوەی دوو چیرۆک یان زیاترە، کە رووداوەکانیان لە هەمان کات یاخود دوو کاتی یەکساندا ڕوودەدەن، گێڕەرەوە بەنۆرە بەشێک لە چیرۆکی یەکەم دەگێڕێتەوە، دواتر لە گێڕانەوەی ئەو دەوەستێت و دەست دەکات بە گێڕانەوەی چیرۆکی دووەم، پاشان لە گێڕانەوەی ئەویش دەوەستێت و بەشێک لە چیرۆکی سێیەم دەگێڕێتەوە تا دەگات بە کۆتایی، واتە ڕۆماننووس لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، بەشێوەیەکی نۆرەیی و بە چەند تەوەرێک تیشک دەخاتە سەر چیرۆکەکانی نێو ڕۆمانەکەی، بەجۆرێک؛ لە چوارچێوەی چەند پارێکدا ڕووداوەکان دابەشدەکات و بەشێوەیەکی نۆرەیی لە خاڵی سەرەتاوە دەیانگەیەنێت بە خاڵی کۆتایی، چونکە ئەو ڕووداوانەی کە دەیانگێڕێتەوە؛ لەیەک

کاتدا یاخود لە دووکاتی هاوسەنگ و نزیک لەیەکدا ڕوویانداوە، ئەمەش ناچاری دەکات ڕێگەیەکی نۆرەیی بگرێتەبەر بۆ ئاماژەپێدانیان» (٤١)، بڕوانن دەبینن ئەم تەکنیکە پەیڕەو کراوە لە ڕۆمانەکە، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کە یەکێک لە چیرۆکەکان هاوکات یان نزیک نییە لە کاتی ئەو دوو چیرۆکەی تر کە ڕوویان داوە، واتە ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی گشتی بەسەر سێ چیرۆکی سەرەکیدا دابەشبووە، ئەو سێ چیرۆکە لە چەندین پاردا نەخشکراون..

١.چیرۆکی نزار و لیڤیتانت... پەیوەست بە شۆڕشەوە. دەستپێکی ڕۆمانەکە باسی زیندان و چونی وەفا بۆ ناو شۆڕش، ناسینی لیڤیتانت، بینینی وەفا بۆ بولبولیار و تێهەڵکێشکردنی چیرۆکی یەکەم بۆ دووەم بە نزیکەی لێرەوە دەست پێدەکات، هەرچەند پێشتر ئاماژەی زۆر تیایە، بەڵام وەک دابەشکردنی پارەکان. هەڵهاتنی نزار لە دەست لیڤیتانت، بوونی وەفا بە چاودێر و جاسووس، گرتنەوەی نزار و دواتر ئازادکردنی لەلایەن دەسەڵاتی سەرەوە، شکانی هەستی دەسەڵات لای لیڤیتانت و بوونی بە بەعسی، بینینی باڵەکانی وەفا و ناسینی نزار و نەغەدە.. ئەمانە هەموویان هۆکاری بەیەکەوە بەستنی چیرۆکەکانی (١-٢)ن. وردە چیرۆکەکانی ئەم بەشە زۆرن، ئەمانە درێژەی هەیە تا ئەوەی نەغەدە چیی لێدێ بەدەست شۆڕشگێڕان، لە دکتۆر شوکاک بۆ نزار پاشان بۆ شیرخان و لەو بۆ لیڤیتانت.. چۆن شۆڕشگێڕان لەم کایەیەدا گەمەی خۆیان دەکەن، گەمەی دەسەڵات بۆ دانپیانان بەیەکدیدا. لیڤیتانت و نزار لەبوون بەشۆڕشگێر بۆ بوون بە بەعسی و دواتر بوونەوە بە شۆڕشگێڕو لە ڕاپەڕینەکەشدا بە تەواوی چیرۆکی (١-٢) دەگاتە ترۆپک بەوەی، کە وەفا بولبولیار دەبینێت.

٢.چیرۆکی بولبولیار و فریشتە و کەشتیی فریشتەکان و خانمی مەلەکبین.... لەم چیرۆکەدا باسی بولبولیار و هاوڕێکانی و هەڵکردن و تەبابوون لەگەڵ هەژاری، دیتنی فریشتە لەلایەن بولبولیارەوە کە ڕووداوێکی گرنگی ئەم گێڕانەوانەی چیرۆکی دووە. پاش بینینی مەهدائیلی فریشتە و ئاشنابوونی بە نەغەدە و شیعرەکانی، دووبارە بینینەوەی مەهدائیل و نووسینی «باڵەکانت دەبینم» بە خەتێکی گەورە سەرەتای پەیوەندیی دروستکردنە لەگەڵ چیرۆکی یەکەم، هەروەها دەرکەوتنەوەی مەهدائیل لە ساتە سەختەکانی ژیانی بولبولیار کە ساڵانی شەڕی ئێران و عێراق بوو، دانیشتنی لەگەڵ دکتۆر شوکاک و مەهدائیل بۆ زامنکردنی ئازارەکانی شوکاک لەدەست خیانەتی نەغەدە، چونکە شوکاک لەلایەن لیڤیتانت دەگیرێ لەماوەی گیرانیدا کە شەش مانگ دەبێ چەندین ڕووداو بەسەر نەغەدە دێت، کە دکتۆر تووشی شۆک دەکات، دیارە یەکەم بینینی فریشتەش بۆ شوکاک پاش ئەو دیلبونەیە، کە فریشتەی جەنەراڵیکی زامدار دەبینێ. پاشان ئالودەبوونی بولبولیار بە کەشتی و بە فریشتەکانی، دانیشتن لەگەڵ ڕێزانی مەلەکبین و چیرۆکی فریشتە و گۆڕستان و نەخۆشخانەی فریشتەکان، چیرۆکی خودی کەشتی فریشتەکان و گەڕانەوە بۆ زۆر ڕابردوو، پەیوەندیی بولبولیار بە نەغەدە و هەوڵدان بۆ هێشتنەوەی شاعیرێتی نەغەدە و پەیوەندییەکانی بولبولیار و نەغەدە و وەفا، پاشان ترازانی فریشتەکەی نەغەدە (ماردینیا) گێڕانەوەی ئومێد





بۆ فریشتەکانی دی بە سەماکانی، دوای ماچەکەی نەوای خوشکی نەغەدە و دکتۆر شوکاک نەمانی ئومێد لەنێو کەشتیی فریشتەکان، پەیوەستبوونی بە خیانەتەکانەوە، خیانەتی شۆڕش و مرۆڤەکان لەیەکتری، فریشتەکان بەلێشاو دەمردن، وای لێهات ماردینیا مرد ئیدی دکتۆر شوکاک دابڕ لە کەشتیی فریشتەکان ئومێد و ژیانی دایە کزی، چونکە لە دوای ساڵی ١٩٩٠ەوە ژیان لە کەشتیی فریشتەکان ئەستەم بوو(٤٢)، لەبەر ئەوە بولبولیار لە راپەڕیندا تەنیا ئێواران دەهاتەوە لای فریشتەکان، بۆیە پەیوەندیی چیرۆکی یەکەم و دووەم بە چڕی لێرەدا دەردەکەوێت، کە ساتی راپەڕینە و فریشتەی وەفا ناترازێ و بەدوای بولبولیار شەیدایە تا لەو دەردە دەری بێنێت، بینینی فریشتە لەلایەن وەفاوە وەک پردی پەیوەندیی نێوان چیرۆکی(١-٢)ە، کە لە سەرەتاو کۆتایی رۆمانەکە باسکراوە.

٣.چیرۆکی تایبەتی وەفا خۆیەتی لەهەوڵدان بۆ نووسینی یادەوەرییەکانی و زیندان بوونییەکەی، کات ئێستایە، دووری و دابڕانێک هەیە لەنێوان کاتی ئەم چیرۆکە لەگەڵ چیرۆکەکانی (١-٢). ئەم چیرۆکە باسی ئەوە دەکات چۆن هەوڵدرا وەفا پەشیمان بێتەوە، چۆن ئەم رۆمانە نووسرا، باسی ئازارەکانی وەفاو بێوەفایی دۆستانی دەکات، لەبەر ئەوەی وەفا کەسێتییەکی سەرەکی و هاوکات نووسەرەکەشە، واتە کەسێکی خاوەن رۆڵە، نەک ئەوەی لە دەرەوە بێت، بەڵکو خۆی پشکی شێری بەردەکەوێت لە رووداوەکانی رۆمانەکە، وەفا لە سەرەتاوە دەستی کرد بە نووسینەوەی یادەوەرییەکانی، یادەوەری و کارەکانی وەفا بەدرێژایی ژیانی شۆڕشی هۆکارێکە زۆرترین رووداوەکان لە دەوری خۆی بخولێتەوە، بۆیە وەفا لەم چیرۆکە باسی چۆنیەتیی دەستبەسەرداگرتنی دەفتەری یادەوەرییەکانی و ئاشکرابوونی رێکخراوەکەی و کوشتنی چیرۆکنووسە دیارەکە (سەعید یۆنان)ی دەکات. ئەم بەشە تایبەتە بە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی کە بۆ یەکەمجار وەفا بەنددەکرێ و ئازارەکانی نێو زیندانی لە بورجەکەدا.

ئەم سێ چیرۆکە توند بەیەکەوە بەستراونەتەوە، لەبەر ئەوە دەتوانین بەمجۆرە بڵێین تەکنیکی هاوسەنگە، بەڵام نابێ خێرا بڕیار بدەین، گرنگە ئاماژە بەوە بکەین کە تەکنیکەکە لە تێهەڵکێشیشەوە نزیکە، ئەم تەکنیکە بریتییە لە «تێهەڵکێشکردنی چەند ڕووداوێکی جیاوازە لەهەمان ڕۆماندا، بەبێ ڕەچاوکردنی زنجیرەی بەدوای یەکداهاتنی ڕاستەقینەیی ڕووداوەکان لە ڕووی کاتەوە» (٤٣). لە کەشتیی فریشتەکانیشدا ئەمە دەبینرێت، کاتێ چەندین رووداو تێهەڵکێش دەکرێت، چیرۆکی کەشتیی فریشتەکان، پەیوەست بە وەفا، یان چیرۆکی نەغەدە و دکتۆر شوکاک و نزار و لیڤیتانت پەیوەست بە کەشتیی فریشتەکان و بولبویار، بەو مانایەی کە دکتۆر شوکاک و بولبولیار مەلەکبین بوون، هاوکات پەیوەندییەکی توندیان لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا هەبوو، لەم تەکنیکەدا رۆماننووس «زنجیرەی بەدوای یەکداهاتنی کاتی رووداو تێکدەشکێت، ئەمەش بەهۆی گرنگیدانە بە چۆنیەتیی ڕوودانی ڕووداوەکان نەک زنجیرەیی ڕوودانیان» (٤٤). لە لاپەڕە ٣٩ی رۆمانەکەدا هاتووە کە باسی سزای شۆڕش دەکات بۆ بولبولیار و حەسیب، «لە سەردەمی ئێستاماندا کردنەوەی کۆمپانیایەکی ساختە چەند ئاسانە، لە ساڵانی

هەشتاشدا دەرکردنی بڕیاری کوشتن بۆ کەسێک وا ئاسان بوو» گەر ورد بڕوانین تێکشکاندنی زەمەن دەبینین، پێشخستن هەیە، دۆزینەوەی پەیوەندیی ئێستا هەیە، ئەم پێشخستنە کە لە ڕووداوەکانی ساڵانی هەشتا بەپێی گێڕانەوەی ڕۆمانەکە دەبێ باسی کاتی ئێستا بکرێت، بەواتایەکی تر بەپێی ڕەوتی گێڕانەوەی ڕۆمانەکە دابڕان و پێشخستن گەڕانەوە هەیە، بەواتا لەوپەڕی پێشخستنتندا گەڕانەوە هەیە، چونکە کاتی گێڕانەوە ئێستایە، بەڵام کاتی حیکایەت ڕابردووە، گێڕەرەوە کە باسی ساڵانی هەشتاکان دەکات لە ئێستادا، بەڵام لە پڕ باسی ئێستا دەکات پێشخستنە بەپێی کاتەکە، بەڵام لە ڕاستیدا خۆی گەڕانەوەیە، چونکە کۆی گێڕانەوەکە گەڕانەوەیە بۆ ڕابردوو، لە لاپەڕە ٢٠١دا باسی ساڵی ٢٠٠٩ دەکرێت کە وەفا بەڕێوەبەری ئاسایش بووە، واتە پێش ئەوەی بگیرێت. لەبەر ئەوە کاتی ڕۆمانەکە کاتێکی بزۆک و سرکە، تەنانەت کۆتایی ڕۆمانەکەش لەنێوان ڕابردوو و ئێستا و ئایندەدایە، کە کۆتاییەکی کراوەیە، کات ڕەگەزێکی گرنگی ڕۆمانە لەبەر ئەوەی چەند ڕۆڵی هەیە لە تێگەیشتنی دەقەکە هێندەش ڕۆڵی دەبێت لە ئاڵۆزکردنی، زۆرکات ڕاستیی ڕۆمان و ناڕاستی پەیوەست دەکرێت بە کاتی ڕۆمانەوە (٤٦)

تەکنیکی هاوسەنگ بەکارهێنراوە و دەشێ سوود لە هەندێ خەسڵەتی تەکنیکی تێهەڵکێش بینرابێت، بڕوامان وایە گێڕانەوە شتێ نییە کە بیبەستینەوە کە دەبێ لەم تەکنیکە لانەدەین، واتە وەک کراسێک بێت پڕ بە بەری گێڕانەوە ببێت. گەلێک ڕۆماننووس هیچ لەبارەی تەکنیکەوە نازانن بەو جۆرەی کە زانستییە، بەڵام چەندین هونەریش لە بەرهەمەکەیدا بەدیدەکرێت، لەبەرئەوە ئەم ڕۆمانە سێ چیرۆکی هەیە بەشێوەیەکی نۆرەی دەگێڕدرێتەوە، ئەم بنیاتەش لە هونەری سینەماییەوە نزیکە، وەک چۆن لە سینەما ڕووداوێک نیشاندەدرێت، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ پنت و شوێن و ڕووداوێکی دی، لەوێشەوە بۆ شوێنێ دی، واتە نمایشکردنی دیمەنەکان و مونتاژکردنییەتی بەشێوەیەک بینەری زیاتر لە خۆی کۆکاتەوە (٤٧) چونکە ئەمە شکاندنی گێڕانەوەی کلاسیکییە و لە ڕۆمانیشدا خوێنەر چێژ لەم شێوازە زۆر دەبینێت. گەر وردبینەوە لە ڕۆمانەکە، ئەمە باش بەدیدەکەین، پاش ئەو سەرەتاییە کە ڕێگە بۆ ئەم هونەرە خۆشدەکات، پارەکان بەم جۆرە دابەشدەبن بەسەر ئەو سێ ڕووداوەی باسمان کردن (بەشێوەیەکی ڕێژەیی). لە لاپەڕە ١٢١دا باس لە پەیوەندیی نزار و نەغەدە دەکات، لە لاپەڕە ١٢٢دا لە پارێکی دیدا باسی کاتی ئێستا دەکات کە وەفا تێیدا دەژی، واتە دوو کاتی جیاواز دوو ڕووداوی جیاواز، دوو چیرۆکی جیاواز. چونکە بەپێی پارەکان ڕووداوەکان دابەشکراو بەسەر ئەو سێ چیرۆکەدا. لە لاپەڕە ٢٤٣ باسی ڕزگارکردنی نزار دەکات لەلایەن دکتۆر شوکاک، لەهەمان لاپەڕە لە پاری «کوشتن لە سەردەمێکی دی»دا باسی وەفا دەکات، کە دەفتەری یادەوەرییەکانیان دزیوە و دەیگرن. لەو ڕۆمانەدا مۆنتاژی شوێنی و کاتیش بوونی هەیە، وەفا لە شوێنێکە، بەڵام زەینی لە زەمەندا دەسوڕێتەوە، کاتێ لە زیندانەوە لەو ژوورەی کە شۆڕشی بیر دەخاتەوە. مۆنتاژی شوێنیش بۆ نموونە بیرکەوتنەوە ئەو شەوەی جادەی غەمپاشا. یان وەفا کە لەیەک کاتدایە لە زیندان، بەڵام ئەو





شوێنانەی بیری دەکەوێتەوە فرەن.
ئەم ڕۆمانە لە ڕووی کاتەوە تەنیا کاتی رابردوو نییە، بەواتا لەوپەڕی رابردووەوە باسی ئایندە دەکات، ئایندەیەک ڕووی داوە، بەڵام بۆ خوێنەر ڕووی نەداوە، هاوکات دەستپێکی ڕۆمانەکە بەلێشاو زانیاریی ناڕوونت دەداتێ، کە ژیانی دەوێت لەگەڵ ڕووداوەکان تا تێدەگەیت چ باسە، لە یەکەم لاپەڕەدا هاتووە «چیرۆکی یەکتر ناسینی «نزار ئیدریس» لەگەڵ «لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی» مێژوویەکی درێژی هەیە. یەکەم یەکتر بینینیان دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێک بەر لەدەرکەوتنی «نەغەدە ماردینی» لە ژیانی هەردووکیاندا» ئەم دەستپێکە پڕپەتی لە ناڕوونی، چونکە چەندین زانیاریی نیوە ڕوونت دەداتێ، چەند سەرەداوێکت دەداتێ، مێژوویەکی درێژ، نازانی کەی، ئایا کەی نەغەدە دەرکەوتووە لە ژیانیاندا؟ نەغەدە کێیە هەروەک گێڕەرەوە کێیە؟ یەکتر ناسینەکەیان چیی لێدەکەوێتەوە بە دۆستایەتی یان چی...چەندین پرسیاری تر.
وەک سەرەتا گوتم ئەم ڕۆمانە فرە بونیادی گێڕانەوەی تێدا ڕەچاوکراوە.
لەم کۆتاییەدا باسی ئەوە دەکەم، کە چۆن و بە چ بەڵگەیە ئەم ڕۆمانە دەشێ بونیادی بازنەیی تێدابێت. بونیادی بازنەیی «دەستپێکردنی ڕووداوەکانە لە خاڵێکی دیاریکراودا و دواتر گەڕانەوەیانە بۆ هەمان خاڵ» (٤٨). واتە کۆتایی ڕووداوی ڕۆمانەکە لە سەرەتا باسکراوە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆی.
لە لاپەڕە ٣٢ی ڕۆمانەکەدا هاتووە «لە چادرێکی شیندا ڕێکەوتی «هۆشەنگی بولبوبیار»م کرد»، هەمان نووسین و هەم بینین و هەمان ڕووداو، واتە کاتی ڕاپەڕینەکە لە لاپەڕە٩٠٠دا هاتووە.
کە سەرەتای ڕۆمانەکە کۆتاییە و کۆتاییەکەش سەرەتایە. بەڵام ئەمەش نەبووەتە هۆی ئەوەی خوێنەر لە سەرەتاوە ئاگاداری کۆتایی ڕۆمانەکە بێت، بۆ ئەمە هەم ناڕوونیی هێناوەتە ئاراوە کە پێویستە، هەم تەکنیکی بازنەی کراوەی بەکارهێناوە. هاوکات ئایا دەتوانین بە بازنەیی دابنێین لەکاتێکدا ئەمە کتێبی یەکەمە (واتە ڕۆمانەکە بەرگی یەکەمییەتی و هێشتا درێژەی هەیە)، لەوەش گرنگتر بپرسین ئایا چیرۆکی سەردەمی ئێستا و گرتنی وەفا تێپەڕکردنی ئەو چیرۆکە نییە کە تەنیا لە دەوری بازنەکە دەخولێتەوە، یان ئەمە بەشێکە لە تەکنیکی بازنەی کراوە، کە توانیویەتی لە دوو لاوە کراوە بێت لەوەی ئەو چیرۆکە تێپەڕێنێت، کە تا سەردەمی ڕاپەڕینە، لەوەش کە بەشێوەیەکی کراوە کۆتاییەکی نوێی هێناوەتە ئاراوە؟
لە کۆتایی ئەم بەشە نووسینەدا لەسەر تەکنیکی ڕۆمانەکە دەڵێین بونیادی گێڕانەوەی ئەم ڕۆمانە بونیادێکی ئاوێتەیە. چەند بەڵگە بێنینەوە بۆ ئەوەی بازنەییە، هێندەش بەڵگە هەیە بۆ تێهەڵکێش، بۆ هاوسەنگیش بەهەمانجۆر، لەبەرئەوە (گێڕەرەوە... سەرەڕای بەکارهێنانی بنیاتی بازنەیی، پەنای برووەتە بەر بنیاتەکانی تریش، ئەمە لە ڕۆمانی ئێوارەی پەروانەشدا هەستی پێدەکەین (٤٩).

**سەرچاوەکان:**

١.ئالبێر کامۆ، مرۆڤی یاخی، و.ئازاد بەرزنجی، کتێبخانەی ئەندێشە-سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢. ل.٢٤٤
٢.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان- کتێبی یەکەم،

چاپخانەی ڕۆژهەڵات، لە بڵاوکراوەکانی ئەندێشە، ساڵی ٢٠١٢. لا. ٨٩.

٣.دکتۆر عیرفان مستەفا، بوونی مرۆڤ و دەرکەوتەکانی، چاپخانەی منارە-هەولێر، ساڵی٢٠١٠، لا. ١٤١.

٤.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا. ٧.

٥.سەرچاوەی پێشوو، لا.١٣١.

٦.ئەلبێر کامۆ، مرۆڤی یاخی، لا.١٨٨.

٧.دکتۆر محەمەد کەمال، فەلسەفەی هیگڵ، دەزگای سەردەم- سلێمانی. لا. ١٨.

٨.ئەلبێر کامۆ، مرۆڤی یاخی، لا. ٢٤٤.

٩.سەرچاوەی پێشوو، لا. ١٧٠

١٠.سەرچاوەی پێشوو، لا. ١٧٠

١١.سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٦٧

١٢.بەختیار عەلی، جەمشید خانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆی دەیبرد، ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ساڵی ٢٠١١.

١٣.ئەلبێر کامۆ، مرۆڤی یاخی، لا. ١٦٧.

١٤.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان.لا. ٥٨٤.

١٥.سەرچاوەی پێشوو، لا. ٥٨٤.

١٦.سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٤٠.

١٧.ئەلبێر کامۆ، مرۆڤی یاخی، لا.٢٦.

١٨.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا. ٧٢٨.

١٩.سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٩.

٢٠.ئازاد حەمە، فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژی یان پاتۆچکە، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی، ٢٠١٠.لا.١٣٢.

٢١.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا. ٢١.

٢٢.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣

٢٣.بەختیار عەلی، چێژی مەرگدۆستی، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، کتێبخانەی ئەندێشە چاپی کردووە-سلێمانی، ساڵی ٢٠١١.

٢٤.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا ٤٢

٢٥.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا ٥٢

٢٦.سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٧.

٢٧.سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٠.

٢٨.سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٢٧.

٢٩.سەرچاوەی پێشوو، لا ٧١٧.

٣٠.سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٦٠.

٣١.سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٦٢.

٣٢.سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٧.

٣٣.سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٠.

٣٤.سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٨٧.

٣٥.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٥.

٣٦.سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، بەشی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس.. هەولێر.٢٠٠٧.

٣٧.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا ١٤.

٣٨.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٢.

٣٩.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٧٣.

٤٠.میران جەلال محەمەد، بنیاتی ڕووداو لە ڕۆمانی کوردیدا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی-سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٩- ٦٦.

٤١.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٧.

٤٢.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا ٨٧٩.

٤٣.میران جەلال محەمەد، بنیاتی ڕووداو لە ڕۆمانی کوردیدا لا. ٨٦.

٤٤.سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٦.

٤٥.بەختیار عەلی، کەشتیی فریشتەکان، لا ٣٩.

٤٦.میران جەلال محەمەد، بنیاتی ڕووداو لە ڕۆمانی کوردیدا لا ٤٥.

٤٧.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٨.

٤٨.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٤.

٤٩.سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٩.



# بەختیار عەلی:

## گەر لەو دونیا مرۆڤ دەرفەتی هەبوو، دەمەوێت لەوێش ببمەوە بە ڕۆماننووس!

**سازدانی: دانا فایەق**

**هەر قسەکردنێک دەربارەی ڕۆمانی کوردی، بەبێ قوڵبوونەوە و وەستانی جددی لەسەر تێکستەکانی (بەختیار عەلی)، کارێکی ناتەواو و پڕ کەموکورتی دەردەچێت و زەحمەتە بتوانرێ وەک قسەکردنێکی زانستی و ویژدانی سەیری بکرێ. قورسایی ئەم ڕۆماننووسە لەناو ئەدەبیاتی ئەمڕۆی کوردیدا بە جۆرێکە، کە ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێ ئەگەر بڵێین مێژووی نووسینی ڕۆمانی لە ئەدەبیاتی کوردیدا کرد بە دوو قۆناغەوە، پێش بەختیار عەلی و دوای بەختیار عەلی، هەر ئەمەیە وای کرد لە گۆڤاری (گەلاوێژی نوێ)دا دۆسیەیەک تایبەت بکەین بە ڕۆمانەکانی ئەم ڕۆماننووسە و ئەم گفتوگۆیەش بەشێکە لەو دۆسیەیە..**

# له منداڵییەوە تێگەیشتم جوانیی چیرۆك پابەندی حیکایەت نییە، بەڵکو گرێدراوی حیکایەتخوانەوە

***بەر لە هەرشتێک با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا ڕۆماننووسینت و باسی ئەو سەرەتایە بکەین، کە چۆن بوو بڕیارت دا ڕۆمان بنووسیت؟ ئایا ئەوکاتەش ڕۆمانت باش دەناسی و باش ئاگاداری ئەو ژانرە سەختە بوویت، یان تەنیا حەزێک بوو و ئەتویست ببی بە ڕۆماننووس؟**

-حیکایەتەکانی نەنکم سەرەتابوون، دواتریش باوکم شەوان کۆمەڵێک چیرۆکی سەردەمی جەنگی جیهانیی دووەمی بۆ دەگێڕاینەوە، ڕۆمانێک ئەو زۆر زۆر قەشەنگ و جوان دەیگێڕایەوە و زۆر پێمان دووبارە دەکردەوە، ڕۆمانی «چارەنووسی مرۆڤێک»ی شۆلۆخۆف بوو. بە کاریگەریی ئەو چیرۆکانە، مەیلێکی زۆرم لە خۆمدا بۆ گێڕانەوەی چیرۆک و بوون بە چیرۆکنووس هەست پێ دەکرد. یەکەمین هەوڵی چیرۆکنووسینم ڕەنگە ریشەکەی بگەڕێتەوە بۆ تەمەنی دوازدە ساڵی، ئەوکات دەفتەرێکی تایبەتیی بچوکم درووست کرد و چیرۆکم تێدا دەنووسییەوە. لەزەتی گێڕانەوە لە لەزەتی بیستنەوە هەڵدەقوڵێت. ماڵی ئێمە سێ حیکایەتبێژی باشی تێدابوو، نەنکم، باوکم، ئامۆژنم. هەر یەکەیان چیرۆکی تایبەتی خۆی و ستایلی تایبەتی خۆی لە گێڕانەوەدا هەبوو. من لە منداڵییەوە تێگەیشتم جوانیی چیرۆک پابەندی حیکایەت نییە، بەڵکو گرێدراوی حیکایەتخوانەوە. سەرەتا بۆ من چیرۆک شتێک بوو لە بری یاری، وەک چۆن منداڵ یارییەکی تۆپێن دەبینێت حەز دەکات خۆشی ببێتە یاریزان، بۆ منیش هەمان شێوە بوو، کاتێک چیرۆکێکی جوانم دەبیست، دەمویست لە فۆرمێکی تر و بە شێوەیەکی تر دایبرێژمەوە. شتێک لەو سەرەتایەوە زوو تێیگەیشتم ئەوەبوو، هیچ حیکایەتخوانێک ناتوانێت حیکایەتی یەکێکی تر جوانتر لە حیکایەتی خۆی بگێڕێتەوە... ئەو حیکایەتانەی نەنکم بە شێوازی خۆی دەیگێڕانەوە، حیکایەتی باوکم نەبوون، ئەو ئەسڵەن نەیدەتوانی لەوجۆرە چیرۆکانە بگێڕێتەوە. هەر چیرۆکبێژە و چیرۆکی خۆی هەیە، یان هەر مرۆڤە و چیرۆکی خۆی هەیە. بۆیە سەرەتای ڕۆماننووسین لای من پابەندی ئەو هەستە بوو، کە بتوانم بگێڕمەوە و ببینم ئەوانی تر چۆن دەگێڕنەوە. گێڕانەوە هونەرێکە مرۆڤ دەبێت فێری بێت. هەڵبەت دواتر کە گەورە بووم و ڕۆمانم وەک هونەرێکی قورس ناسی، تێگەیشتم کە گێڕانەوە تەنیا هونەر نییە، تەنیا سەنعەتێک نییە فێری ببین، تۆ کە لەسەر کورسییەکی جوان دادەنیشیت، لە خۆت ناپرسیت ئەمە کێ دروستی کردووە، کە سوار ماشێنێک دەبیت، ناپرسیت ناوی ئەو کرێکارانە چین کە لە خولقاندنی ئەم ئامێرەدا بەشداربوون، ئەوە سەنعەتە، سەنعەت ئەو هونەرە گشتییەیە، کە دەشێت هەر کەس فێری بێت، ئەو بەشەی هونەری نووسینە، کە دووبارەکردنەوەی زۆر گرنگ نییە، ئەو بەشەی ئیشەکەیە مرۆڤ دەبێت بیزانیت، بێ ئەوەی ئەوە ئەسڵی کارەکە بێت. بە کورتی ڕۆماننووسینیش وەک هەموو ئیشێکی تر، مرۆڤ دەبێت سەرەتا بەشە سادە و گشتییەکەی فێربێت کە سەنعەتی گێڕانەوەیە. ئەو بەشەی کە مرۆڤ بێ ئەو ناتوانێت ڕۆماننووس بێت، بەڵام فێربوونی سەنعەتی گێڕانەوە بەشی ئەوە ناکات کەسێک بکاتە ڕۆماننووس. کەس وەک ڕۆماننووس نایەتە دونیاوە، هیچ نووسەرێک لە جەوهەردا نابێتە نووسەر، ئەگەر لاسایی نووسەری تر نەکاتەوە، هەمیشە وابووە و

ڕۆماننووسینیش وەک هەموو ئیشێکی تر، مرۆڤ دەبێت سەرەتا بەشە سادە و گشتییەکەی فێربێت کە سەنعەتی گێڕانەوەیە. ئەو بەشەی کە مرۆڤ بێ ئەو ناتوانێت ڕۆماننووس بێت، بەڵام فێربوونی سەنعەتی گێڕانەوە بەشی ئەوە ناکات کەسێک بکاتە ڕۆماننووس





**یەکەمین کۆڕی بەختیار عەلی ١٩٩٢. بەختیار عەلی و مەریوان وریا قانع**

واش دەمێنێتەوە، هەموو هەوڵدانێک بۆ نووسین لە ژێر کاریگەریی نووسینێکی تردایە، بۆ نموونە کاتێک دەبیتە شاعیر، شاعیرێکی تر کاری تێ کردوویت. کاتێک دەبیتە چیرۆکنووس، لە ژێر کاریگەریی چیرۆکنووسێکی تردایت. بۆ منیش لە سەرەتادا زیاتر کاریگەریی چیرۆکنووسانی تربوو، سەرەتا هەمیشە لای ئەوانی دییەوە دێت، هەمیشە تێکستێک هەیە بڕیاری ئەوەت پێ دەدا ببیتە نووسەر. سەرسامیی من بە (مارکیز) وای کرد حەزبکەم ببمە ڕۆماننووس، پێش خوێندنەوەی مارکیز خەونەکەم هەبوو، بەڵام هەموو خەونێک پێویستی بەوە هەیە نموونەیەکی پێشینی وەک خۆی لەبەردەستدا بێت، تا دڵنیابێت خەونێکی مەحاڵ نییە. یەکەمین ڕۆمانم (مەرگی تاقانەی دووەم) هەوڵێک بوو بۆ گێڕانەوەی چیرۆکێک لە فۆڕمی (پاییزی پەتریاک)ی (مارکیز)دا، ئەو هەوڵە بریتی بوو لەوەی ئایا منیش دەتوانم لەسەر هەمان تەکنیک، بە هەمان سەنعەتسازی چیرۆکێکی نوێ بگێڕمەوە؟ ئایا دەتوانم تەکنیکێک بەکار بێنم، کە لە بنەڕەتدا بۆ ڕۆمانێکی دی بەکارهاتووە؟. ئێستا بیردەکەمەوە کە (مەرگی تاقانەی دووەم) ئەستەمە بە هیچ فۆرمێک بنووسرێت، ئەو فۆرمە «پۆلیفۆنییە ـ کەرنەفالی»یە نەبێت، فۆرمێک لە مۆسیقاوە نزیکترە تا هونەری گێڕانەوە. سەرەتا هەوڵەکە بۆ من وەک تاقیکردنەوەی دەرمانی نەخۆشییەک بوو لەسەر نەخۆشییەکی دی، پێشتر جۆرە واقعییەتێکی سیحراویم لای یەشار کەمال و سەلمان ڕووشدی و ئەستوریاس بینی بوو، بەڵام واقعییەتە سیحرییەکەی مارکیز هەم واقعی تر و هەم سیحراوی تر بوو. لە سەرەتاوە دەمزانی وەک ڕۆماننووس تەنیا یەک شانسم هەیە بۆ ئەوەی ئەم تەکنیکە تاقی بکەمەوە، گەمژەییە نووسەر بەردەوام

# دروستکردنی کتێبێك وەك دروستکردنی منداڵێك ئەکتێکی ئیرۆتیکییە

بە یەک تەکنیک بنووسێت، ئەوە توانای گێڕانەوەی دەکوژێت، تەکنیک نابێت پێش حیکایەت بکەوێت، لێرەوە لە سەرەتاوە ئەو ڕاستییەم دەزانی، کە ئەمە یارییەکە یەکجار دەتوانم بیکەم، بەڵام بۆ ئەو سەرەتایە گەمەی وا حەڵاڵە، هیچ نووسەرێک کە دەنووسێت سەرەتا بیر لە بڵاوبوونەوە ناکاتەوە، من کە (مەرگی تاقانە)م دەنووسی، یاریم دەکرد، یارییەکی شەخسی و نهێنی و تایبەتی، کە بەتەما نەبووم جگە لە خۆم کەسی تر بیبینێت. بیرت نەچێت کە دەمێک من یەکەم ڕۆمانم نووسی، نووسین چ لە ڕووی سیاسییەوە، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، چ لە ڕووی خێزان و شەخسیشەوە، شتێکی زۆر لە حەرام و قەدەغەی لەسەر بوو. نووسین لە خەیاڵی دەستەجەمعیی ئێمەدا زۆر لە تابۆوە نزیکە، شتێکە لە چەشنی سێکس، بەڵام بە قەڵەم. ئەوەی سێکس و نووسین پێکەوە کۆدەکاتەوە ئەوەیە هەردووکیان نهێنین، هەردووکیان زۆر بە بێدەنگ دەکرێن، هەردووکیان سەرەتا بۆ ئەوە نین دونیا پێی بزانێت، واتە تەعبیرن لە بوونی خسوسییەتێکی مرۆڤانەی قووڵ، تەعبیرن لەوەی ئێمە وەک مرۆڤ جیهانی خۆمان و نهێنیی خۆمان و فەزای ڕۆحی و جەستەیی خۆمان هەیە، هەردووکیان گێڕانەوەی ئینسانن بەرەو ئەو فەزا تایبەت و پریڤاتە، هەردووکیشیان بە جۆرێک لە جۆرەکان دواتر دەرەنجامەکانیان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، هەردووکیشیان دوو ئیشن، کە هەم بە لەش و هەم بە ڕۆح دەکرێن. بە کورتی دروستکردنی کتێبێک وەک دروستکردنی منداڵێک ئەکتێکی ئیرۆتیکییە. ڕۆمان تێکەڵبوونێکی ئیرۆتیکییە لە نێوان حەز و هوشیاریدا، حەزێکی هۆشیارە و هۆشیارییەکی بارکراویشە بە حەز، بەڵام خۆشبەختانە ڕۆماننووس بێئاگا هەردوو دۆخەکە دەژی... دەبێت چەندین ساڵ بەسەر هەموو تێکستێکدا تێبپەڕێت تا نووسەر خۆی بە تەواوەتی تێدەگات بۆچی نووسیوێتی.

***پرسیارەکەی من ئەوە بوو، ئەوکاتەی بڕیارت دا ڕۆمان بنووسیت، هەستت بە قورسیی نووسینی ڕۆمان دەکرد؟ هەستت ئەکرد ئەوە بوارێکە ئازایەتیی دەوێ ئینسان خۆی لێ بدات، ئەگەر بییەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێ؟ هەستت دەکرد ئەو بوارە مەعریفە و ژێرخانێکی زۆر قوڵی ڕۆشنبیریی پێویستە، بۆ ئەوەی ببیت بە ڕۆماننووس، وەک چۆن قسەیەک هەیە دەڵێت ڕۆماننووس فەیلەسوفە!. ئەوکات هەستت بەو هەموو قورسییەی ئەو بوارە دەکرد؟**

-زۆر هەستم پێی دەکرد، من گەورەبووم کە دەستم بە ڕۆماننووسین کرد، واتە مێژوویەکم لەگەڵ خوێندنەوە و کتێبدا هەبوو، بەڵام لە هەر دۆخێکدا بێت نووسەر دەبێت دەست بکات بە نووسین و دواتر بپرسێت «ئایا دەتوانم بنووسم؟». کە دەستنووسی ڕۆمانی (مەرگی تاقانەی دووەم)م تەواو بوو، باوەڕم بەوە نەبوو وەکو ڕۆمانێکی کامڵ تەماشای بکەم. تا ئەو تێکستەم نەدا بە مامۆستا شێرزاد حەسەن و ئازاد عەبدولواحید و هەندێک برادەری تر و خوێندیانەوە، قەناعەتم وا نەبوو ئەمە ئەو تێکستە بێت، کە دەمەوێت بینووسم. مرۆڤ وەک نووسەرێکی گەنج خەیاڵی گەورەتری هەیە لە توانای خۆی، نەک هەر ئەوە، بەڵکو بۆ تێکستێک دەگەڕێت بەرزتر بێت لە تێکستی شکسپیر و دۆستۆیڤسکی و فۆکنەر... ئەو تەماحە وای دەکرد لە (مەرگی تاقانە) ڕازی نەبم، وەک

ئەوەی سێکس و نووسین پێکەوە کۆدەکاتەوە ئەوەیە هەردووکیان نهێنین، هەردووکیان زۆر بە بێدەنگ دەکرێن، هەردووکیان سەرەتا بۆ ئەوە نین دونیا پێی بزانێت، واتە تەعبیرن لە بوونی خسوسییەتێکی مرۆڤانەی قووڵ، تەعبیرن لەوەی ئێمە وەک مرۆڤ جیهانی خۆمان و نهێنیی خۆمان و فەزای ڕۆحی و جەستەیی خۆمان هەیە



زۆربەی نووسەران، سەرەتا بەدوای نووسینی کتێبێکی جوانەوە نەبووم، بەدوای موعجیزەیەکەوە بووم. مرۆڤ زۆری دەوێت تا قەناعەت بە خۆی دەهێنێت دەبێت کتێب بنووسێت نەوەک موعجیزە بنوێنێت. لە بنەڕەتدا فیکرەی (مەرگی تاقانەی دووەم) لەوە گەورەتر بوو، کە ئێستا ئێوە دەیبینن، واتە من ئەمەم تەنیا وەک فەسڵی یەکەم و دووەمی ڕۆمانێکی گەورە تەماشا دەکرد، بەڵام دواتر بینیم ئەو دوو فەسڵە بۆ خۆیان چیرۆکی سەربەخۆن و جیهانێکی تایبەتییان هەیە، چیرۆکێکە هەموو تایبەتمەندییەکی ڕۆمانێکی بچوکی تێدایە، لێرەوە وەک تێکستێکی سەربەخۆ وەرم گرت و بوو بە تێکستێکی تایبەتی. دوای ئەوەی (مەرگی تاقانەی دووەم)م نووسی، نزیکەی دە ساڵ ڕۆمانی ترم نەنووسی، جگە لە پرۆژەیەکی تری ڕۆماننووسینم لەو بەینەدا، کە وەکو دەستنووس تا ئێستاش ماوەتەوە و چاپ نەبووە و ناشزانم ئاخۆ قەت چاپ دەبێت یان نا، بەڵام تا دەگەینە (ئێوارەی پەروانە) لە ساڵی ١٩٩٨دا، نزیکەی دە ساڵ بوو ڕۆمانێکم تەواو نەکردبوو. لە ناکاو ئێوارەیەکی ساڵی ١٩٩٧ بڕیارم دا چیتر بەدوای موعجیزەدا نەگەڕێم، بە خۆمم گوت کاتی ئەوە هاتووە کتێبێک بنووسم، کتێبێک دونیا سەرەوژێر نەکات، بەڵکو کتێبێک بخوێنرێتەوە و بمێنێتەوە. ئەوە بوو دانیشتم و (ئێوارەی پەروانە)م نووسی. (ئێوارەی پەروانە) نیشانەیەک بوو بۆ ڕزگاربوونی من لە خەون و غروری نووسەرێکی گەنج. پێش ئەوە شیعرم دەنووسی، لێکۆڵینەوەم دەنووسی، کۆڕم سازدەکرد، بەڵام ڕۆمان هەمیشە وەک خەوێکی مەحاڵ دەهاتە پێش چاوم، لە هەموو جێگەیەک خۆمم وەک ڕۆماننووس ناودەنا، بێ ئەوەی شتێکی وەهام کردبێت، ڕۆمانم وەک شتێک سەیردەکرد، کە دەبێت موعجیزەی پێ بسازێنم، لە ڕێگەیەوە بلیمەتییەکی بێ وێنە بنوێنم. ئەم خەونە بێمانایە مایەی ئەوە بوو، ئەوەی لەو دە ساڵەدا نووسیبوم دەری نەخەم، ئەوە بۆخۆی نیشانەی ئەوەیە پرۆسەکە لای من چەند قورس بووە.

***ئەوکاتەی (مەرگی تاقانەی دووەم)ت دا بەو نووسەر و هاوڕێیانەت، چاوەڕێی چ وەڵامێکت لێ دەکردن؟ نەدەترسای وەڵامێکی وات بدەنەوە، کە هەرگیز جارێکی تر بەلای نووسینی ڕۆماندا نەچیتەوە؟**

-لە ڕاستیدا چاوەڕێی ئەو ئیعجابە زۆرە نەبووم، بەتایبەتی لەلایان مامۆستایان شێرزاد حەسەن و ئازاد عەبدولواحیدەوە، کاک ئازاد عەبدولواحید زۆر کەم بە تێکستێکی دەوت باش، ڕەخنەگرێکی سەختگیر بوو، دیدگاهێکی ئەدەبیی ڕوون و تا ئەندازەیەک فۆرمالیستیی هەبوو، هەروەها مامۆستا شێرزادیش ڕۆمانناسێکی باش بوو، ڕۆمانی زۆری خوێندبووەوە، ئەزموونی زۆری لەگەڵ ئەدەبی ئینگلیزیدا هەبوو و لەو ئەدەبەوە کاری وەرگێڕانی دەکرد، ئەویش سەخت بوو ددانی بە کارێکدا بنایە... بە گشتی ئێمە «من و هاوڕێکانیشم» وەک کۆمەڵە گەنجێکی خوێندەوار خۆمان زەحمەت بوو ددانمان بە کارێکدا بنایە، زاڵمانە بە هەق و ناهەق گاڵتەمان بە هەموو ئەدەبیاتی پێش خۆمان دەکرد. لە هەلومەرجی وادا ئاسان نییە غروری خۆت بخەیتە بەر تاقیکردنەوەیەکی قورس و ترسناکەوە، من لەو ماوەیەدا لای هەندێک هاوڕێم گوتبووم کە ڕۆمانێکم نووسیوە... گەرچی مەرگی تاقانەی دووەمم وەک

# مەرگی تاقانەی دووەم نیشانەی عەشق و کینەی منە بۆ شار




کارێکی ناتەواو تەماشا دەکرد، بەڵام نەدەوەستام لەوەی بڵێم «بەڵێ ڕۆمانێکم تەواوکردووە». هەواڵی ئەوەی من ڕۆمانێکم نووسیوە یان دەینووسم، بە جۆرێک لەناو هاوڕێ و ناسیاوانمدا بڵاوبووبووەوە، کە ئیتر نەدەکرا گوێی خۆمی لێ بخەوێنم و خۆمی لێ کەڕبکەم... وابوو ئیتر ڕۆمانەکەم جارێکی تر لەسەر دەفتەرێکی نوێ نووسییەوە و دامە برادەرانم، لە ئەسڵدا مەرگی تاقانە دووەمم لەسەر سنووری ئێران لە گوندێک بە ناوی سیاگوێز نووسی، هەڵبەت گوند نەبوو، هیچ نەبوو، تەواو خاپوور بووبوو، تەنیا دوو ماڵی تێدابوو، من و گۆران باباعەلی و ئاکۆ غەریب و دارا ئارامی نیگارکێش لەوێ لە خانوویەکی کۆندا دەژیاین، پێشتریش لەو خانووەدا لەگەڵ فاروق ڕەفیق ژیابووم، کابرایەکی دوژمنداری گوندەکی ئەو ماڵەی بە قەد بەرزاییەکی سەختەوە دروستکردبوو، گوندەکە تەنیا چارەکێک لە گوندی چەمپاراوی ئێرانەوە دوورە، من (مەرگی تاقانەی دووەم)م لەوێ نووسی... ئێستا هیچ بیرم نییە، چ دەرد و بەدبەختییەک پاڵی بە منەوە ناوە، لەو فەزا ترسناکەی جەنگی عێراق و ئێراندا و لەو شوێنە چۆڵ و ترسناکەی سنوور، کاری وا بنووسم، بەڵام دواجار کە مەرگی تاقانەم خوێندەوە، هەستم بە نۆستالژیایەکی نهێنی کرد، نۆستالژیایەکی ژێرەوانکێ بۆ ژیانی شار، من ئادەمیزادێکی شاریم، فەزای چۆڵەوانی و گوند تەنیا بۆ ماوەیەک دەمبەن، مەرگی تاقانە نیشانەی عەشق و کینەی منە بۆ شار... شوێن لە مەرگی تاقانەدا لە هەر شتێکی تر گرنگترە، ناکرێت لەسەر کاری خۆم زۆر قسە بکەم، بەڵام دەکرێت بڵێم مەرگی تاقانەی دووەم دۆکیۆمێنتە لەسەر کەسێک، کە پەیوەندیی بە شوێنەوە تێکچووە. بەڵام بە گشتی زۆر کەم چاوەڕێی ئەوەم دەکرد ڕۆمانەکەیان بە دڵ بێت، دواتر کە وەڵامەکەیانم وەرگرتەوە، سەیربوو بەلامەوە، بەتایبەت مامۆستا شیرزاد، کە زۆر زۆر سەرسام بوو پێی. مامۆستا لەگەڵ تێکستەکەدا زۆر گریابوو، لە هەندێک چاوپێکەوتنی خۆیدا باسی «مەرگی تاقانەی دووەم»ی کرد... لەوێوە ئیتر شتەکان دەستیان پێ کرد. ڕۆمانی مەرگی تاقانەی دووەم ڕەنگە یەکێک بێت لەو ڕۆمانە کەمانەی دونیا، کە پێش ئەوەی بڵاوبێتەوە، هەم ناوبانگ و هەم نەفرەت بۆ خاوەنەکەی بهێنێت. ئەو سەرەتایە بێ ئاگایی من، بێ ویستی من، بێ ئەوەی من دەستێکم تێیدا هەبێت، هەم دوژمنی بێرەحم و هەم



سەرەتا بەدوای نووسینی کتێبێکی جوانەوە نەبووم، بەدوای موعجیزەیەکەوە بووم. مرۆڤ زۆری دەوێت تا قەناعەت بە خۆی دەهێنێت دەبێت کتێب بنووسێت نەوەک موعجیزە بنوێنێت



هەواداری دڵسۆزی بۆ دروست کردم.

***وتت پاش یەکەم ئەزموونت، دە ساڵ دوای ئەوە دووەمین ئەزموونی ڕۆماننووسیت تاقیکردەوە و بڵاوت کردەوە، واتە پاش ئەوەی بە باشی لە قورسی و هونەری نووسینی ڕۆمان تێگەیشتیت، ئینجا دەستت دایە دووەمین کار. پاش ئەوەی بەو جۆرە ڕۆمانت ناسی و شتەکان چوونە قۆناغێکی ترەوە، خۆت چۆن سەیری ئەزموونەکەی یەکەمت کرد؟**

- (مەرگی تاقانەی دووەم) بۆ من هەتا ئێستاش یەکێکە لە باشترین کارەکانم لە رووی بونیادەوە، رەنگە وەکو شێوازی گێڕانەوە، فراوانکردنی سنووری حیکایەت، کۆنترۆڵکردنی ڕووداو لە ئاستی زەمان و جێگەدا، بیناکرن، کاراکتەر، پلۆت و ئەو شتانەوە، شێوازی من لەو کاتەوە زۆر گەشەی کردبێت یان توانا و نەفەسی ڕۆماننووسینم باشتر بووبێت، دەسەڵاتم بەسەر ئیشکردندا لەسەر زیاد لە خەتێکی گێڕانەوە گەشەی کردبێت، بەڵام وەکو بونیاد و ساختار (مەرگی تاقانەی دووەم) تا ئێستا تۆکمەترین تێکستمە. ئەوەی بتوانیت کۆمەڵێک دەنگی زۆر بێنیت، کە سەر بە ژینگەی جیاواز بن و ئازار و خەمی جیاوازیان هەبێت، بەڵام تێکڕا بەشداربن لە گێڕانەوەی یەک چیرۆکدا، خودی ئەمە تا ئەندازەیەکی زۆر کارێکی سەختە. بۆ من گرنگ بوو دەنگی زۆر بهێنم، کە هەم شتێک لە خسوسییەتی خۆیان دەرخەن و هەم چیرۆکەکەش بە ئەندازەی بەشداریی خۆیان بگێڕنەوە... ئەوە قەت کارێکی ئاسان نەبوو. ئێستاش تا ئەندازەیەکی زۆر، کە سەیری ساختاریی (مەرگی تاقانەی دووەم) دەکەمەوە، پێم سەیرە لەو تەمەنەدا کارێکی وام کردبێت، لە غەزەلنووسدا نەبێت، کە بونیادێکی سەختتر و فرەلۆچتر و بەیەکداچووتری لە «مەرگی تاقانەی دووەم» هەیە. پێکهات و بونیادی ڕۆمانەکانی ترم لە «مەرگی تاقانە» ئاسانترن. تا ئێستا کە زۆربەی خوێنەران لە مەرگی تاقانە تێناگەن، لەبەر ئەوەیە شتێک لە سەر تەکنیک و بونیادی ڕۆمان حاڵی نابن... ئاسانە هەموو خوێنەرێک لەزەت لە دواهەمین هەناری دونیا ببینێت، بەڵام تەنیا ڕۆمانناس و خوێندەواری باش دەتوانێت لەزەت لە مەرگی تاقانەی دووەم ببینێت.



**دایک و باوکی بەختیار عەلی**

***باسی ئەوەت کرد پاش دە ساڵ لە نووسینی (مەرگی تاقانەی دووەم) ئینجا ڕۆمانی (ئێوارەی پەروانە)ت نووسی، ئێستا پازدە ساڵ بەسەر نووسینی (ئێوارەی پەروانە)شدا تێپەڕیوە. لە نێوان ماوەی مەرگی تاقانەی دووەم بۆ ئێوارەی پەروانە، تێڕوانین و بیرکردنەوەت بۆ ڕۆمان زۆر گۆڕا و بە جۆرێکی تر ڕۆمانت دەبینی. ئەی لە نێوان (ئێوارەی پەروانە) و (کەشتیی فریشتەکان)**

# سەرەتا بە دوای نووسینی کتێبێکی جوانەوە نەبووم، بە دوای موعجیزەیەکەوە بووم

**دا، کە تازەترین رۆمانتە، چ گۆڕانێک لە تێڕوانینتدا دروست بووە و گەڕانەوەت بۆ (ئێوارەی پەروانە) چۆنە؟**

-لە سەردەمی (مەرگی تاقانەی دووەم)دا زۆر حەزم لە تاقیکردنەوەی فۆرم و ستایلی نوێی ڕۆماننووسین بوو، بەڵام ئێستا و دوای ئەو چەند ساڵە، ئەوەندەی خولیامە جۆرێک لە میعماریی گەورە و فرەدیو و فرەدەنگ دروست بکەم، شتێک لە فۆرمدا خاڵی نەبێت لە شکۆداریی فۆرمی کلاسیک، مەبەستم ئەزموونی فۆرم نییە. لە راستیدا جاران ئەزموونگەراتر بووم لە ئێستا، ئێستا هێندەی دەمەوێت چیرۆکەکان فۆرمی تایبەتی خۆیان دروست بکەن، بەدوای ئەوەوە نیم تەکنیکێکی ئامادە یان سیفاتی زاڵی ڕێبازێکی ئەدەبی لە کاری خۆمدا تاقی بکەمەوە. جاران دەمگوت دەبێت من ڕێبازێک بگرم، دەبێت بە وردی سەر بە قوتابخانەیەکی ئەدەبی بم، بەڵام ئێستا نا، ئێستا خولیای وا بە شێتی دەزانم. لە (مەرگی تاقانە) دا تەکنیک پێش تەواوی ڕەگەزەکانی تر کەوتبوو، بەڵام قسەی وا بۆ «دواهەمین هەناری دونیا» یان «کۆشکی باڵندە غەمگینەکان» دروست نییە... لەماندا تەکنیک گرێدراوی تەواوی چیرۆکەکەیە، لە تەکنیکی تێکستێکی ترەوە وەرنەگیراوە. تەکنیک شتێکە دەکرێت لە مەزهەبێکی ئەدەبییەوە بیخوازین، دەشکرێت تایبەت و خسوسی بێت و تەنیا لە یەک چیرۆکدا بەکاری بهێنین و دواتر هەرگیز دووبارەی نەکەینەوە. ئەگەر راستت بوێت لە (کەشتیی فریشتەکان)دا رەنگە نیوکلاسیک نووسیبێتم و کارم کردبێ، ئەمڕۆ بەشی هەرە زۆری ئەدەبی دونیا نیوکلاسیکە. لە نیوکلاسیکدا هەندێک ڕەگەزی کلاسیک بە خسوسییەت و شێوازی خۆمان بەکاردەهێنینەوە. لە رۆمانێکی وەک (کەشتیی فریشتەکان)دا بەدوای ئەو ستایلە معمارییەدا وێڵبووم کە دەچێتەوە سەر میعماری کلاسیکە گەورەکان، وەک تۆلستۆی، تۆماس مان، یەشار کەمال. لام وایە یەشاریش لە ریزی کلاسیکییە گەورەکاندایە، بەڵام لای من ئەو ستایلە هاوشانی هەوا و نەفەسی واقعییەتی سیحرییە. ئەوەی بتوانین سیحراوی بین، سوریالی بین، فەنتازی بین، بێ ئەوەی دەستبەرداری فەخامەتی کلاسیک بین، ئەوە خەونێکی گەورەی منە. لە نێوانی ئەم چواردە پازدە ساڵەی کۆتاییدا، تێڕوانینە بنچینەییەکانم بۆ رۆمان نەگۆڕاون، ئەوەی گۆڕاوە تایبەت بە کۆمەڵێک پرسی دیکەیە: ئایا دەتوانم بە رۆمان چی بکەم و چی بگێڕمەوە و لەو رێگەیەوە تا چەند دەتوانم بچمە ناو رووداوە مێژوویییەکان و دەروونی مرۆڤەکانەوە؟ رەنگە وەڵامی ئەم پرسیارانە گۆڕابێتن، بابەتەکان و غایەتم گۆڕابن ... ئایا چ بابەتێک تێمەی سەرەکیم بێت؟ چ جۆرە مرۆڤێک پاڵەوانم بن؟ ئەمانە گۆڕاون، بەڵام تێڕوانینم بۆ رۆمان وەک هونەر نەگۆڕاوە.

***لە کۆی رۆمانەکانی تۆدا دوو جۆر تێڕوانین هەیە بۆ ژیان، کە دوو جۆری زۆر دژ بە یەکن و بەردەوام لە ململانێدان، بەشێکیان ئەوانەن دنیا بەرەو کرانەوە و خۆشبەختی و ئازادیی شەخسی دەبەن، بەشەکەی تریان کەسانێکن رێک پێچەوانەی ئەوە بیردەکەنەوە و کار دەکەن، واتا لایەنێکیان ئەوانەن هەوڵ بۆ جوانکردنی ژیان و ژیاندۆستی ئەدەن، لایەنەکەی تر پەیامی مەرگ و تاریکییان پێیە.. لە کۆی رۆمانەکاندا ئەو لایەنە سەردەکەوێ کە ژیان**



تا ئێستا کە زۆربەی خوێنەران لە مەرگی تاقانە تێناگەن، لەبەر ئەوەیە شتێک لە سەر تەکنیک و بونیادی رۆمان حاڵی نابن... ئاسانە هەموو خوێنەرێک لەزەت لە دواهەمین هەناری دونیا ببینێت، بەڵام تەنیا ڕۆمانناس و خوێندەواری باش دەتوانێت لەزەت لە مەرگی تاقانەی دووەم ببینێت



**بەرەو وێرانە دەبات و ژیاندۆستەکان شکست دێنن. ئەمە جۆرێکە لە ڕەشبینیی خۆت بەرامبەر ژیان، یان تەنیا تێڕوانینی کاراکتەرەکانە و لە دەسەڵاتی تۆدا نییە؟**

-من هەرگیز گەشبین نەبووم، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەشبینی لای من یەکسان نییە بە مردن و کارنەکردن و بێهیوایی، ڕەشبینین شتێکە و بێهیوایی شتێکی دیکەیە، بێهیوایی بە ئاقاری ئیفلیجیدا دەڕوات، جۆرە لاوازی و بێهێزییەکی شەخسی دروست




دەکات، دۆخێکی دەروونی و سایکۆلۆژییە، بەڵام ڕەشبینین جۆرە تێڕوانینێکی فەلسەفییە بۆ هەموو وجود. ڕەشبینی لای من مۆتیڤێکە بۆ ئەوەی بە قوڵی بیر لە ژیان بکەمەوە، نرخێکی نێگەتیڤی نییە. ڕەشبینی ناتوانێت پاڵەوانەکانم یاخود خودی خۆم وا لێ بکات بکشێمەوە و خاڵی کۆتایی دابنێم. ڕەشبینی لای من خاڵی سەرەتایە، ژیان لە زۆربەی تێکستەکانی مندا بە ڕەشبینی دەست پێ دەکات و تا ئەندازەیەکی زۆر بە ڕەشبینیش کۆتایی دێت. بە گشتی لە ڕۆمانەکانی مندا گەشبینی گەورە بوونی نییە. پێشتریش لە چاوپێکەوتنێکدا باسم کردووە، کاراکتەرەکانم دەزانن لە جەهەنەمدا دەژین، بەڵام هەوڵ دەدەن فێربن چۆن لە جەهەنەمدا بژین.

***مەبەستم ئەوە نییە کاراکتەرەکان گەشبینن، مەبەستم ئەوەیە هەوڵ بۆ ژیانێکی باشتر ئەدەن و ئەیانەوێ دەرچن لەم ژیانە خراپە، بەڵام هەوڵەکەیان شکست دێنێ و ناتوانن ئەو کارە بکەن.**

-ڕاستە.. لەبەر ئەوەی پرۆژەی مرۆڤ و هەوڵی بۆ باشکردنی ژیان بە گشتی شکستی هێناوە. ئەگەر سەیر بکەیت لە ئادەم و حەواوە تا ئەمڕۆ مرۆڤ بە گشتی هەوڵ ئەدات ژیان باشتر و جوانتر بکات و خۆی بەختەوەرتر بکات، بەڵام بەردەوام ئەم پرۆژانە شکست دەهێنن. بەردەوام لە ئادەم و حەواوە تا ئەمڕۆ حوزنێک و شکستێک هاوشانی مرۆڤە و تا ئەم لەحزەیەش لەگەڵ خۆیدا ئەو حوزن و شکستە دەگێڕێت. هیچ مۆدیلێکی سیاسی و شارستانی و هیچ ئایدیایەکی فەلسەفی نەیانتوانیوە مرۆڤ بخەنە سەر شەقامی ئەو بەختیاری و بەهەشتە ونەی ئادەم یادگاری و یادەوەرییەکەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ئێرە و بە ئیرس بۆی جێهێشتووین، ئەم دۆخە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە ڕۆمانەکاندا ڕەنگی داوەتەوە.

***ئەم وەڵامەی تۆ دەمانگەیەنێتە ئەوەی، لە کۆی ڕۆمانەکانی تریشتدا، کە دواتر دەیاننووسیت هەمان تێڕوانین و دونیابینی دووبارە ببنەوە و چاوەڕێی**

# ئەو مرۆڤەی بەختەوەریی خۆی بکات بە پێوەر بۆ بەخۆش ناساندنی ژیان، بوونەوەرێکی بیمارە

**هەمان شت بکەین، قەت چاوەڕێی خۆشبەختی و ژیانێکی باشتر نەکەین لە ڕۆمانەکانی تۆدا؟**

-ڕەنگە گۆڕانکاری بەسەر تێڕوانینە بنەڕەتییەکاندا نەیەت، ناکرێت لە دۆزەخێکی وەک ژیاندا مرۆڤێکی تەواو بەختەوەر و خۆشبین بدۆزینەوە. خۆشبەختی پابەندی دۆخی شەخسیی خۆمان نییە. ئەو مرۆڤەی بەختەوەریی خۆی بکات بە پێوەر بۆ بەخۆش ناساندنی ژیان، بوونەوەرێکی بیمارە. جیاوازیی سەرەکیی نێوان مرۆڤەکان لە نێوان پلەی خۆشبەختی و بەدبەختیاندا نییە... ئەوەی مرۆڤ لە مرۆڤ جیادەکاتەوە، شێوەی بەدبەختییەکەیانە... بەدبەختترینیشمان ئەوانەن کە خۆشبەختن، چونکە لە ئێستادا مرۆڤ تەنیا لەسەر فەرامۆشکردنی تراژیدیای گەورەی ژیان دەتوانێت خۆی وەک بەختەوەر پێناسە بکات. ئەگەر پاڵەوانەکانی داهاتووشم لەسەر هەمان هێڵ بڕۆن، گەر تراژیدی و غەمگین بن، ئەوا تاوانێکیان ئەنجام نەداوە، بەڵکو وەکو پاڵەوانی زۆربەی ڕۆمانەکانی دیکەی دونیا، کە زۆربەیان لەسەر هەمان هێڵ ڕۆشتوون، هەقیقەتی بوون و ژیان نیشان دەدەنەوە. بە بڕوای من زۆربەی تێکستە گەورەکانی دونیا تێکستی شکستن... چ شەرمێک لەوەدایە پاڵەوانەکانی من وەک ئۆدیبۆس و هاملێت و کارامازۆفەکان بن... ئەدەب چییە جگە لە مەیدانێک بۆ دەرخستنی جەوهەری تراژیدیی ژیان؟.

***زۆر کەس هەن ڕەخنەی ئەوە لە ئیشی تۆ دەگرن، کە زمانی کاراکتەرەکانت یەک زمانە و زۆربەیان وەک یەک قسەدەکەن و بیرکردنە و مەعریفەیان نزیکە لە یەکەوە، ئەمەش دەکاتە مەعریفە و بیرکردنەوە و**




**زمانی خۆت. واتا لە پشتی هەر کاراکتەرێکتەوە خۆت ئامادەیت و تۆیت قسە ئەکەیت و بیر ئەکەیتەوە و ڕۆڵ ئەبینی نەک کاراکتەرەکان.. ئەم قسەیە تا چەند لەجێی خۆیەتی؟**

-موبالەغەیەکی بێمانایە بڵێن هەموو پاڵەوانەکان وەک یەک قسە دەکەن یان هەموویان ڕۆشنبیرییان وەک یەکە، یان هەموویان بە زمانی نووسەر قسە دەکەن، بەتایبەت زۆرجار بێ هیچ دەلیلێک ئەم قسەیە دەکرێت. گەر بە ئینسافەوە تەماشا بکەن لە (مەرگی تاقانەی دووەم)ـەوە بۆ (کەشتیی فریشتەکان) سەدان پاڵەوانی جیاواز و دەنگی جیاواز قسە دەکەن، گەر هەموویان وەک من بیریان بکردایەوە، نەدەکرا وەفای ڕەفعەت بەگ لە موزەفەری

بە بڕوای من زۆربەی تێکستە گەورەکانی دونیا تێکستی شکستن... چ شەرمێک لەوەدایە پاڵەوانەکانی من وەک ئۆدیبۆس و هاملێت و کارامازۆفەکان بن... ئەدەب چییە جگە لە مەیدانێک بۆ دەرخستنی جەوهەری تراژیدیی ژیان؟



سوبحدەم، خەندان لە نەغەدە ماردینی، سەوسەن فیکرەت لە ڕێزانی مەلەکبین، جەمشید خان لە مەنگوڕی بابە گەورە یان شێرخان جیابکەینەوە... گەر ئەمانە کۆپی منن، چۆن دەکرێت لە یەکیان جیابکەینەوە، ئەی جیاوازییەکانیان لە کوێوە دێت؟. لە ڕاستیدا هۆی ئەم هەستە ناگەڕێتەوە بۆ ڕۆمانەکانی من، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دونیایەی ئێمە، کە بیرکردنەوەی تێدا نییە، لە دونیای ئێمەدا بیرکردنەوە غائبە، ئەوانەی پێیان دەڵێن ڕۆشنبیران لە هەموو توێژەکانی تر دوورترن لە بیرکردنەوە. لێرەوە هەموو ئەوانەی بیردەکەنەوە هەتا گەر جیاوازیش بیربکەنەوە، هەتا گەر دژ بە یەک بیربکەنەوە، بەرامبەر بەوانەی کە ئەسڵەن بیرناکەنەوە، فەلسەفەیەکی ژیانیان نییە، زمانی قسەیان نییە، لە یەک دەچن. دوو زماندار لە ناو خێڵێکی لاڵ و بێزماندا قسەشیان جیاوازبێت و دوژمنیش بن، هەر لە یەک دەچن. پاڵەوانەکانم لە یەک ناچن، بەڵام بە حوکمی ئەوەی لە خەڵکی تر ناچن، مەخلوقاتی بێعەقڵ و بێزمان نین، توانای قسەکردنیان لەسەر خۆیان و دەوروبەریان هەیە، شتێکی هاوبەشیان هەیە، کە لەوانی دی جیایان دەکاتەوە... ئەوانەی ئەو جۆرە قسانە دەکەن لە نێوان فەلسەفە و ڕوئیادا جیاکارییان بۆ ناکرێت. ئەوانە خەڵکانێکن ناتوانن جیاوازی بکەن لە نێوان گەڕان لە کۆڵانەکانی تێکست و گەڕان لە کۆڵانەکانی گەڕەکی خۆیاندا، بە جۆرێک تووشی بیماریی واقعییەت بوون، بە جۆرێک لە بیمارستانی واقعییەتدا نەخۆشن و کەوتوون، لەوە تێناگەن پاڵەوانی ئەدەب مەحکومە بەوەی ڕوئیای هەبێت، جیهانبینیی هەبێت، دەبێت توانای هەبێت قسە لەسەر ژیانی خۆی بکات. ئەگەر تۆ تەماشا بکەیت روئیای پەروانە لە کوێ و روئیای سەوسەن فکرەت لە کوێ؟ هەردووکیان دوو ئافرەتن لەناو کێشمەکێشی ژیاندان، هەردووکیان دوو روئیای فەلسەفییان هەیە، بەڵام ئەم تێگەیشتنە فەلسەفییەیان بۆ ژیان زۆر جیاوازە و دوورە لە یەک. سەوسەن فکرەت لەماڵی خۆی ناچێتە دەرەوە، بەڵام پەروانە لە دەستپێکردنییەوە نیازی تەنیا هەڵاتن و راکردنە لە ماڵ. سەوسەن دەیەوێت جیهان بێنێتە ناو ماڵەکەی خۆیەوە، پەروانە بە پێچەوانەوە دەیەوێت خۆی بەرەو دونیا رابکات. مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ئەم جۆرە بەراوردکارانە بکەین لە نێوان پاڵەوانەکاندا، زۆرێک لەو قسانە بە درۆ دەخرێنەوە. پەروانە فەیلەسوف نییە، بەڵام دەزانێت چیی لە ژیان دەوێت. پاڵەوانەکانی من هیچیان نە رۆشنبیرن نە فەیلەسوف، بەڵکو بوونەوەری وریان، بوونەوەری بینەرن... بوونەوەرگەلێکن دەتوانن قسە بکەن، ئەوەش لە کولتوورێکدا کە قسەی کوشتووە، قسەی کورتکردووەتەوە بۆ هەندێک کلێشەی ڕووت. دیارە لە جەهلستانێکی وەک واقعی ئێمەدا، ئەمە دەبێتە شتێکی عەجایەب، لە دونیایەکدا زمان تێیدا بەکار نایەت، عاجباتییە پاڵەوانەکانی ئەدەبیش بتوانن زمان بەکاربهێنن. مرۆڤی واقعی لە ئەدەبیشدا دەیەوێت هەمان ئەو جەهل و بێدەنگییە ببینێتەوە، کە لە واقعدا هەیە. پاڵەوانەکانی دۆستۆیڤسکی زۆربەیان روئیای فەلسەفییان بۆ ژیان هەیە و زۆربەشیان بە هەمان زمان قسە دەکەن، ئەوە حاڵی پاڵەوانەکانی شکسپیریشە، بەڵام پاڵەوان تەنیا لە هەڵوێستێک و ڕوئیایەک بۆ ژیان دروست نەبووە، مرۆڤ کورت ناکرێتەوە

# پاڵەوانەکانی من هیچیان نە ڕۆشنبیرن نە فەیلەسوف، بەڵکو بوونەوەری وریان، بوونەوەری بینەرن





پاڵەوانەکانم لە یەک ناچن، بەڵام بە حوکمی ئەوەی لە خەڵکی تر ناچن، مەخلوقاتی بێعەقڵ و بێزمان نین، توانای قسەکردنیان لەسەر خۆیان و دەوروبەریان هەیە، شتێکی هاوبەشیان هەیە، کە لەوانی دی جیایان دەکاتەوە

بۆ ڕوئیایەک یان جیهانبینییەک، یان هەڵوێستێکی فەلسەفی. ئیشی ڕۆماننووسە خسوسییەت و تایبەتمەندیی مرۆڤەکان بەرجەستە بکات. کێشەکە هیچ کات ئەوە نییە پاڵەوانەکە فەلسەفەی هەیە یاخود نا، بەڵکو ئەوەیە ئاخۆ بوونێکی جیاوازی ئەوتۆی هەیە بکرێت تێکەڵی نەکەین و چیرۆکەکەی لەگەڵ چیرۆکی کەسانی تردا نەئاڵۆزکێنین؟ ئەوەی گرنگە ئەوەیە، ئایا من وەکو نووسەر توانیومە ئەم کاراکتەرە جیابکەمەوە لە کاراکتەرێکی تر؟ کاتێک ئەو قسەیە ڕاستە، کە پاڵەوانەکانی من لە یەک جیانەکرێنەوە، هەموویان فۆتۆکۆپیی نوسخەیەکی یەکەم بن، کە خودی نووسەرە. ئایا مەنگوڕی بابە گەورە، یەکسانە بە ماجیدی گوڵ سۆلاف؟ ئایا محەمەدی دڵشووشە یەکسانە بە هۆشەنگی بولبولیار؟ بێگومان یەکسان نین، چونکە پاڵەوان تەنیا لە جیهانبینییە فەلسەفییەکەی دروست نابێت، بەڵکو لە کۆمەڵێک موفرەداتی تری ژیان و کۆمەڵێک سیفاتی تری کاراکتەر دروست بووە و ئەم سیفاتە گشتییانە پێکڕا دێن وێنەی ئەم بوونەوەرە درووست دەکەن. من نووسەرێک نیم سێ چوار کاراکتەرم درووست کردبێت تا نوسخەیەکی یەکەم و ئۆرگیناڵ هەبێت لەبەری شۆرابێتنەوە. من دەیان کاراکتەری جیاواز لە ڕۆمانەکانمدا هەن، کە هەریەکەیان ژیان و خسوسییەت و فەلسەفەی خۆیان هەیە.

خاڵی دووهەم و هۆی دووهەم، کە ئەم وەهمە هەڵەیەی دروست کردووە، دەگەڕێتەوە بۆ جیابوونەوەی زمانی نووسین لە زمانی قسەکردن. جارێک لە مارکیز دەپرسن بۆچی ڕۆمانەکانی تۆ دیالۆگیان تێدا نییە؟ دەڵێت بەوەدا لە ئیسپانیدا



زمانی نووسین جیایە لەگەڵ زمانی قسەکردندا، وەختێک پاڵەوانەکان بە زمانی نووسین قسەدەکەن. ئەو زمانە تۆنێکی هاوبەش بەسەریاندا دەسەپێنێت و وادەکات وا دەربکەون وەک لە یەکتری بچن. ئەم کێشەیە ئێستا لە زمانی کوردیشدا سەری هەڵداوە، زمانی نووسین و قسەکردن جیاوازە. لەم چەند ساڵەدا ڕستەسازی و وشە و پێکهاتی تەعبیر لە نێوان نووسین و قسەکردندا تەواو جیابووەتەوە، پاڵەوانەکان کە بە زمانی نووسین قسەدەکەن، تۆنێکی ڕۆشنبیرانە وەردەگرن، کە جیاوازە لەگەڵ زمانی عەوامدا. گەر پاڵەوانەکان بە زمانی قسەکردن بدوێن، تێکستەکە زۆر لە جوانیی خۆی لەدەست دەدات... بۆ هەندێک کاراکتەر و بۆ هەندێک حاڵەت ئەوە پێویستە و من کردوومە، بەڵام من نووسەرێک نیم بمەوێت هەموو پاڵەوانەکانم وەک خەڵکی ناو بازاڕ قسە بکەن، من تەنیا چیرۆک ناگێڕمەوە، ئیشی نووسەرە نەخشەیەک بۆ ڕوئیاکان لە سەردەمی خۆیدا بکێشێت، ئەوەش تەنیا بە زمانی سادە و سواو و بێڕۆحی قسەکردنی ڕۆژانە ناکرێت.




ڕۆمانەکانی من بۆیە دەخوێنرێنەوە چونکە ئەو بەرزبوونەوەیەی تێدایە بەسەر ژیانی ڕۆژانەدا، ئەو ڕەهەندەی تێدایە، کە ئەگەر ڕووداوەکانیش سەرەنجمان ڕانەکێشن، دیالۆگ و هەڵوێستە وجودییەکان ڕامان دەگرن. من هەوڵم نەدا وەک مارکیز خۆم لە کێشەکە بدزمەوە بەوەی دیالۆگ لە ئەدەبی خۆم بکەمە دەرێ، پێم وایە دیالۆگ ڕەگەزێکی گەورەی ژیان و ڕۆمانە، دەبوو لەو ڕێگەیەوە بڕۆم، دەبوو لە پێناوی توانای پاڵەوانەکاندا لەسەر بیرکردنەوە و تەعبیر کارێک نەکەم گەمژە و سادە بنوێنن. زمانی نووسین بۆ دیالۆگ کەمێک ئەرستۆکراتی و ڕۆشنفیکرانە دەنوێنێت، وا نیشان دەدات وەک ئەوەی خاوەنەکانیان یەک ڕیشە و یەک تەباریان هەبێت، بەڵام ئەوە ئیفکتێکی کاتییە، بەتایبەت نەخۆشیی واقعییەت وای کردووە هەندێک زمانی سەرجادە بە زمانێکی گونجاو و بەرز بۆ ئەدەبیات لەقەڵەم بدەن... لەو ڕووەوە جۆرێکی تر بیردەکەمەوە، ئەوەی بە کەڵکی بیرکردنەوە نایەت ئەو زمانە جڵف و سادە و سواوەیە، ڕەنگە ڕۆمان

# من نووسەرێك نیم بمەوێت هەموو پاڵەوانەکانم وەك خەڵکی ناو بازاڕ قسە بکەن

رۆڵێکی گەورە لەوەدا ببینێت، کە زمانی نووسین باشتر و قایمتر بچەسپێت.. ڕەنگە ماوەیەکی تر ئەو نامۆییە نەمێنێت، بەڵام لە ئێستادا پاڵەوانەکان تەنیا ئەو جۆرە زمانە شک دەبەن کۆمەکیان بکات تەعبیر لە خۆیان بکەن.

***جارێ با هەر لای کاراکتەر بمێنینەوە و دوور نەکەوینەوە لێیان. زۆر جار کە قسە لەسەر کاراکتەرەکانی تۆ دەکرێت، لەبەر ئەوەی هەندێک لەو شوێنانەی لە ڕۆمانەکانتدا باسیان دەکەیت، خەڵکانێک پێیان ئاشنان، جاری وا هەیە ئەم ئاشناییە ڕێک دەگوازرێتەوە بۆ کاراکتەرەکانیشت، هەندێک لەو کاراکتەرانە دەشوبهێنرێن بە کاراکتەری واقعی و سیاسیی خۆمان. ئەم بەراورد و لێکدانەوەیە تا چەند لەجێی خۆیەتی و خوێنەر تا چەند پێکاویەتی؟**

-بە دڵنیاییەوە بەشێکە لە فانتازیای خوێنەر، دژی ئەوە نیم خوێنەر فانتازیا بکات و پاڵەوانی ڕۆمانێک بشوبهێنێت بە کاراکتەرێکی واقعی، بەڵام ئەوەی پێت وابێت نووسەر بە ئەنقەست ئەوەی کردووە یاخود من ویستوومە کاراکتەرێک دروست بکەم لە کەسێکی دیاریکراو بچێت، دڵنیابە ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە. هەموو پاڵەوانەکانی من پاڵەوانی فانتازین و هیچیان لە هیچ بوونەوەرێکی واقیعییەوە وەرنەگیراون، ڕەنگە بە شێوەیەکی کەم سیفەتێکی تایبەتییان لە کەسێکدا هەبووبێت و من گواستبێتمەوە بۆ کاراکتەرێک، بەڵام هەرگیز نەمویستووە تەواوی کاراکتەرەکە وەک ئەو کەسە درووست بکەمەوە... شتی وا لە ئەدەبی مندا نییە. هەموو کاراکتەرەکانی من کاراکتەری خەیاڵین و وەزیفەیان لەناو تێکستەکەدا پەیوەندیی بە بوونیانەوە هەیە لە ڕەوتی ڕووداوەکانی ناو حیکایەتەکەدا. بەڵام خوێنەری ئێمە ئەو ساتانە زیاتر لەزەت لە تێکست دەبینیت، کە مەرجەعێکی لە واقعدا بۆ بدۆزێتەوە، کە بڵێت فڵانە کەس لە فڵانە کاراکتەر دەچێت. بە گشتی ڕەنگە ئەم ڕەبتە ئۆتۆماتیکییە بۆ خوێنەری ئەمڕۆ کۆمەکێک بێت، بەڵام خوێنەری سەردەمانێکی تر، کە ئەو کاراکتەرانە ناناسن، یاخود خوێنەری شوێنەکانی تر کاری وەهایان بۆ ناکرێت، بۆ نموونە خەڵکی شارەکانی وەک سنە و دیاربەکر و شوێنە جیاوازەکانی دی، کاتێک ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) و (ئێوارەی پەروانە) دەخوێننەوە، بە یادەوەرییەکی جیاوازترەوە لە خوێنەرێکی سلێمانی یان کوردستانی باشوور دەیخوێننەوە. ئەو خوێنەرانەی نزیکن لە ژینگەی ژیانی منەوە لە شاری سلێمانی، هەندێک ئاماژە لە ڕۆمانەکاندا دەدۆزنەوە، کە پەیوەندیی بە مێژوو و یادەوەریی شاری سلێمانییەوە هەیە. بەڵام لە بنەڕەتدا من بۆ خوێنەری سلێمانی نانووسم، بەڵکو بۆ ئەوانەش دەنووسم کە سەد ساڵێکی تر لەدایک دەبن و هیچ یەکێک لەم کاراکتەرانە ناناسن، کە لە ئێستادا هەن... نووسەری باش بۆ خوێنەرێکی یونفرسال دەنووسێت، خوێنەرێک سەر بە هیچ زەمەن و هیچ جێگەیەک نەبێت. بە کورتی ئیشی ڕۆماننووس دروستکردنی کاراکتەری خەیاڵییە، نەوەک کاراکتەری واقعی، کاراکتەرێک لە هەموو زەمەنێک و هەموو شوێنێکدا هاوشێوەیەکی هەبێت... هەر وێناکردنێکی دیش بۆ پاڵەوانەکان، جگە لەوە وێناکردنێکی هەڵەیە.

***وتت کە کاراکتەری ڕۆمانەکانت واقیعی نین و دروستکراون، بەڵام هەندێک لە ڕووداوی ناو**



هەموو کاراکتەرەکانی من کاراکتەری خەیاڵین و وەزیفەیان لەناو تێکستەکەدا پەیوەندیی بە بوونیانەوە هەیە لە ڕەوتی ڕووداوەکانی ناو حیکایەتەکەدا. بەڵام خوێنەری ئێمە ئەو ساتانە زیاتر لەزەت لە تێکست دەبینیت، کە مەرجەعێکی لە واقعدا بۆ بدۆزێتەوە، کە بڵێت فڵانە کەس لە فڵانە کاراکتەر دەچێت



**رۆمانەکانت هەن بەشێکن لە مێژووی ئەم چەند ساڵەی خۆمان و دەناسرێنەوە. ئەم لێکدانەوەیەی خوێنەر هۆکارەکەی بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە، کە تۆ لەم مێژووەوە واقعەدا کار دەکەیت؟**

-ئەگەر تەماشای مێژووی ئیشکردنی من بکەیت لەناو ئەدەبدا، دەبینیت مێژووی هاچەرخە. من یەکێکم لەو نووسەرە کەمانەی لەسەر مێژووی هاوچەرخ ئیش دەکەم. زۆر بە کەمی نووسەر دەبینی لەسەر مێژووی سەردەمی ژیانی خۆی بنووسێت، جونکە ئەمە لە زۆر رووەوە کارێکی سەختە، لەبەر ئەوەی تووشی کێشەی گەورەت دەکات. یەکێک لەو کێشانەی لە باسکردنی سەردەمی خۆتدا دێتە رێت ئەوەیە، کە پانتایی فانتازیاکردن کەمە، واتا ئەگەر حیکایەتەکەم بگەڕێتەوە بۆ دووسەد ساڵ لەمەوبەر، توانام لەسەر خەیاڵ و فانتازیا ئازادتر دەبێت، بەڵام چونکە زۆربەی رووداوەکانی رۆمانی من لە ساڵانی شەستەوە تا ئەم ساڵانەی دواییە، ئەوە بوار بە هەموو جۆرێکی فەنتازیا نادات. لێرەدا مەحکومم بە پاراستنی چوارچێوەیەکی تەسەوریی تایبەت لای خوێنەر. من واقعی نیم، بەڵام فەنتازیاکانم ڕیشەی مێژوویی و هەقیقییان هەیە، واقعی نەبوون مانای ئەوە نییە، کە بوونەوەرێک لە دەرەوەی مێژوو و لە دەرەوەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی دروست بکەم. واقعی نەبوون مانای ئەوە نییە پەیوەندیی تێکست و واقع بپچڕێت، بەڵکو ئەوەیە ئەو پەیوەندییە بچێتە ئاستێکی میتافۆریی ناڕاستەوخۆوە، زمانێکی ڕەمزی و تەعبیری جێگەی ئەمانەتی دەقاودەق بۆ واقع بگرێتەوە. واقع لێرەدا ئەو ژینگە دەرەکییە، ڕۆژانە، مەتریالییە نییە، کە وەک قەڵغانێکی ئاسنین و کوشندە دەوری داوین، بەڵکو ژینگەیەکی سەمبولی، تەجریبی، میتافۆرییە، بە کورتی کایەیەکی مەجازییە بۆ پاڵەوانەکان تا بتوانن خۆیان ببینن، واقع لێرەدا ئاوێنەیەکە بۆ ئەوە دانەنراوە، واقعی تێدا تەماشا بکەین، ئاوێنەیەکە کە دەچینە بەردەمی تەماشای خودی ئاوێنەکە ناکەین، بەڵکو تەماشای خودی خۆمان لە ئاوێنەکەدا دەکەین... واتە واقع بۆیە لێرەیە تا پاڵەوانەکان خۆیان ببینن. ئەنفال لە پێناوی ئەنفالدا لەوێکانە نییە، بەڵکو لە پێناوی جەلادەتی کۆتردا لەوێیە، مەبەست ئەوەیە بزانم لە فەزایەکی وا تراژیدی و سەمبولیکدا جەلادەت چۆن ڕەفتار دەکات. کۆڕەوەکە لە پێناوی وێناکردنی تراژیدیای نەتەوەیی ئێمە لە دواهەمین هەناردا ناخزێتە سەر سەحنە، بەڵکو لە پێناوی بینینی هەرچی وردتری سەریاسەکان و پاڵەوانەکانی دیدا دێتە سەر تەختی نمایش. مێژوو لە پێناوی مانا مێژووییەکەی خۆیدا بۆ من بایەخێکی نییە، بەڵکو لە پێناوی تێگەیشتن لە پاڵەوانەکاندا دەردەکەوێتەوە، مێژوو ئەو حەوزی مەلەیەیە کە ماسییەکانی تێدایە، ڕۆمانیش چیرۆکی ماسییەکانە، نەوەک چیرۆکی حەوزی مەللەکە بێت. هەموو پاڵەوانێک پێویستی بە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی سیاسیی مێژوویی دیاریکراو هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو واقیعەم تیکەڵ بە فانتازیا و دەستکاریکردنێکی زۆر کردووە. مێژوو حەتمییە لە ناو رۆماندا، جا ئەگەر واقیعی رەخنەیی یان سۆسیالستی یان سیحری بێت، تەنانەت ئەو ئەدەبانەی زۆر لەسەر مەنەلۆگ و ناوەوەی ئینسان کار دەکەن، ئاماژەیان تێدایە بۆ ژینگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی، بەڵام ئەو ئاماژەیە کاتێک نرخی هەیە، کە قووڵ بە ژینگەی ناوەوەی پاڵەوانەکەوە بنووسێت،

# مێژوو کاتێك لەناو تێکستدا مانای هەیە، کە بەشێك بێت لە مێژووی شەخسیی پاڵەوانەکە

بۆ نموونە ئەگەر لە کۆشکی باڵندە غەمگینەکاندا تەماشای ئەو دیمەنە بکەیت، کە سەوسەن دەچێتە ناو ئەمنە سوورەکەوە و شەوێک تێیدا دەخەوێت، ئەمە وێستگەیەکی گرنگە لە ژیانی سەوسەندا، ئەم دیمەنە بۆ باسی ڕاپەڕین نەهاتووە، بەڵکو بۆ باسی سەوسەن هاتووە. بە بڕوای من مێژوو کاتێک لەناو تێکستدا مانای هەیە، کە بەشێک بێت لە مێژووی شەخسیی پاڵەوانەکە، ئەگەر مێژوویەک بێت گرێنەدرێتەوە بە ژیانی پاڵەوانەکەوە، دەبێتە کارێکی دۆکیۆمێنتاریی بێبەها... بە کارێکی واقعیی قێزەوەن، بە دەقێک کە لە نەخۆشخانەی واقعییەتەوە هاتووەتە دەرێ.

***بۆچی کارکردنەکان تەنها لە مێژووی هاوچەرخدان و مێژووی کۆن نەبووەتە بەشێک لە ئەزموونی کارکردنی تۆ؟ ئەمە بڕیارە یان حەزە؟**

-نازانم لەوانەیە تەنیا لەو دونیایەدا بتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەت بە ڕوونی بدەمەوە، ئەوە گەر لەوێ یەکمان بینی.

من کەسێکی زۆر نامۆم بە زۆربەی شتەکان، بە زۆربەی کەسەکان، ڕەنگە بمەوێت لە ڕێگەی ئیشکردنی بەردەوامەوە لەسەر واقعی هەنوکەیی، بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەو نامۆییە بشکێنم، بۆ خۆمی بسەلمێنم بەشێکم لە سەردەمێک، بەشێکم لە خەڵکانێک... بەڵام بڕیاری کۆتاییم نەداوە، مەرج نییە تا مردن هەر لەسەر ئەم شوێنە و ئەم کاتە بنووسم. شوێنکاتێک چ لای خۆم و چ لای پاڵەوانەکان وەک قەفەزێکی ئاسنین و سەختە. هەموو ئەو تێکستانەی تا ئێستا لە خەیاڵمدا بوون و نووسیومن هەم پەیوەندییان بە مێژووی ئێرەوە بووە و هەم بە ژینگەی ئێرەوە، بە جۆرێک لە جۆرەکان شەڕی



بەختیار عەلی

شەخسیی خۆم بوون لەگەڵ مێژوویەکی ڕەشدا. ئەوەی لە بەرنامەمدا بێت تا کۆتایی بەم جۆرە بنووسم، شتی وانییە. هەندێک بیرۆکەی ڕۆمانی مێژوویییم لە مێشکدایە، کە ڕەنگە پاڵەوانەکانی ئەسڵەن کوردیش نەبن و ژینگەی ڕووداوەکانیش کوردستان نەبێت، دوورنییە ژینگەی کۆمەڵایەتیی تر بێت، ڕەنگە بەشەکانی تری کوردستان بێت. زۆر تێکستم لە خەیاڵدان، کە لە داهاتوودا لەوانەیە بییان نووسم، نازانم لەوانەیە قەت فریاش نەکەوم، کێ چوزانێت... سەرەتا دەمگوت تا تەمەنی پەنجا ساڵی دوو ڕۆمانم هەبێت بەوە بەختێکی باشم بووە. من لەو نووسەرانە نیم کە چاوەڕوانیی زۆریان لە خۆیان هەیە، ئومێدم بە نووسین نییە، بۆیە

هەموو ئەو تێکستانەی تا ئێستا لە خەیاڵمدا بوون و نووسیومن هەم پەیوەندییان بە مێژووی ئێرەوە بووە و هەم بە ژینگەی ئێرەوە، بە جۆرێک لە جۆرەکان شەڕی شەخسیی خۆم بوون لەگەڵ مێژوویەکی ڕەشدا.



دەتوانم زۆر ورد و بێباک و پڕ تاقەت بنووسم. وەک منداڵێک یاریی بە لم بکات و هیچ کات وەڕز نەبێت. ڕۆماننووسین تاکە گەمەیەکی جوانە مرۆڤ بۆ پیریی خۆی هەڵی بژێرێت.. من پڕۆژەم لەوە زۆرترە بشێت لە یەک ژیاندا هەموویان تەواوبکەم، گەر لەو دونیا مرۆڤ دەرفەتی هەبوو، دەمەوێت لەوێش ببمەوە بە ڕۆماننووس. لەوێ مرۆڤ کاتێکی زۆری دەبێت... ئەبەدییەت بەسەرماندا دەسەپێنێت هەموو ببینە ڕۆماننووس... هیچ شتێک وەک کاتی زۆر بۆ ڕۆماننووس پێویست نییە... کاتێکی زۆر بە بەرتەقای ئەبەدییەت.

***دەمەوێت لەسەر شیعرییەتی زمانی ڕۆمانەکانت قسە بکەین، تۆ هەست ناکەیت ئەم شیعرییەتە زیانی لە ڕۆمانەکانت دابێت، بە تایبەت لە بواری وەرگێڕاندا، هەروەها ئەو جۆرە لە شیعرییەت نووسەر ناچار دەکات تا ڕاددەیەک درێژتر بنووسێت و جاری واهەیە وەسفی زیاد بڵێ، کە ئەو جۆرە کارکردنە لە ئەدەبیاتی ئێستای دونیادا زۆر مەرغوب نییە.. ئەمە خراپ نین بۆ کارکانت؟**

-هەڵبەت تا زمانی تێکست لە زمانی ئەسڵیدا سەخت بێت وەرگێڕانیشی سەختترە، بەڵام زمانی شیعری لە هەندێک تێکستی مندا بەشێکی گرنگی بونیادی تێکستەکەیە، هۆی سەرەکی کە ڕۆمانەکانی من باش دەخوێنرێنەوە، تەنها ئەوە نییە ئاماژە بە ڕووداوی واقیعی دەکەن یان کاراکتەری تایبەتیان تێدایە، بەشێکیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زمانێکی شیعرییان هەیە. پێم وایە لابردنی ئەم زمانە زیانێکی گەورە لە پێکهاتەی ڕۆمانەکە یان لە سروشتی گەیاندن و شێوەی ئەو پردە دەدات، کە من لە بنەڕەتدا لەگەڵ خوێنەردا دروستم کردووە. زمانی شیعری لە ئێوارەی پەروانەوە تا ئێستا زۆر لە ئایدیا و ئەفکارەکانی منی ڕۆشنتر و جوانتر پەڕاندووەتەوە بۆ خوێنەر، ئاسان نییە دەستبەرداری بم. شاعیرییەتی زمان لە نووسیندا بەشێکی تەواوکارە بۆ شاعیرییەتی بیرکردنەوە و شاعیرییەتی تێڕوانین.

***ئەوەی تۆ باسی دەکەیت بۆ خوێنەری کوردە، من زیاتر مەبەستم وەرگێڕان و خوێنەری بیانی بوو.. مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ڕۆمانەکانت وەربگێڕدرێن، حەتمەن ئەم زمانە وەک خۆی ناتوانرێ بگوێزرێتەوە، ئەمە زیان لە ڕۆمانەکانت نادات و ئەو کات خوێنەری غەیرە کورد ئەتوانێ هەمان چێژ لە کارەکان ببینێ؟**

-من لە سەرەتادا هەرگیز بیرم لە وەرگێڕان نەدەکردەوە، تەنها ڕۆمانێک کەمێک بیرم لە وەرگێڕانی کردبێتەوە (جەمشید خانی مامم) بوو. ئەو ڕۆمانە تێکستێکی کورتە، زمانێکی سادەی هەیە، ئەوەش وا دەکات بۆ وەرگێڕان ئاسان بێت، جەمشید خان خاڵییە لەو نەفەسە شیعرییەی لە غەزەلنووسدا هەیە و خاڵییە لەو قورسایی و بارگە فکرییەش کە ڕۆمانەکانی تریان داگیرکردووە. ئەوە یەکەم ڕۆمانێکی منە کە ڕەنگە کارئاسانییەکی زۆری بۆ وەرگێڕەکان تێدا کرابێت، بەڵام بە گشتی من ئەو شتانە بە دەستی ئەنقەست ناکەم، هەموو نووسەرێک تێکستی هەیە ڕەنگە ساناتر لە تێکستەکانی دیکەی وەربگێڕدرێت. هەست دەکەم ئەگەر بیر لەوە بکەمەوە ڕۆمانەکانم جۆرێک بنووسم بۆ وەرگێڕان ئاسانبن، زۆر لە جوانیی تێکستەکە دەمرێت. خۆت دەزانیت بەشێکی زۆری نووسین ئەو لەزەتەیە کە لە کاتی نووسیندا هەستی پێدەکەیت.

# ئەوەی دەبێت خەونی پێوە ببینین، وەرگێڕی باشە نەك وا لە تێکستەکە بکەین بە کەڵکی وەرگێڕی خراپ بێت

زۆر گرنگە خۆت چێژ لە نووسینی خۆت ببینی و هەست بکەیت شتێک هەیە ناتوەستێنێت، هەست بکەیت ئازادیت لە هەڵڕشتنی خەیاڵ و خۆدانە دەست زماندا، دەبێت لێگەڕێی تێکستەکە بەو جۆرە ئاراستە وەرگرێت، کە خۆی دەیەوێت. ئەگەر زۆر جار بیر لەوە بکەمەوە و بڵێم ئەم زمانە شیعرییەی لێرەدا هەیە ئایا وەرگێڕ دەرەقەتی دێت یان نا؟ جۆرە تێڕوانینی وەها زۆر زیانی گەورە بە نووسین دەگەیەنێت. ئەوەی دەبێت خەونی پێوە ببینین، وەرگێڕی باشە نەک وا لە تێکستەکە بکەین بە کەڵکی وەرگێڕی خراپ بێت.

***مەبەستم ئەوەیە ئەم حاڵەتە زیانی داوە لە شتێکی تر، بۆ نموونە ئەگەر میوانێک رووبکاتە ئەم وڵاتە و باس لە رۆمان بکەین، یەکسەر دەڵێین رۆمانەکانی (بەختیار عەلی)، بەڵام کە تۆ بەو شێوەیە بنووسیت و نەتوانرێت ئەو هێزی زمان و لەززەتە بۆ خوێنەری بیانی بگوێزرێتەوە، ناتوانین قسەکەی خۆمان وەک ئەوەی هەیە بیگەیەنین و بەس تەنها بۆ ئێمەی خوێنەری کورد رۆمانەکان ئەو هێز و چێژەیان دەبێ.**

-کێشەکە لە وەرگێرانەوەیە نەوەک لە نووسین، لە دنیادا زۆر نووسەر هەن بوونە قوربانیی وەرگێڕان. مالارمێ نووسەرێکی گەورەبوو، بەڵام من یەکێکم لەوانەی شیعری مالارمێم کەم خوێندووەتەوە، چونکە وەرنەگێڕدراوە بۆ ئەو زمانانەی دەیانزانم. هەندێک تەرجەمەی زۆر لاوازی بۆ عەرەبی هەیە، بە ئەڵمانیش گەیاندنی ناوەڕۆکی تێکست و مۆسیقای شیعریی تێکستەکان زەحمەتە، لە عەرەبەکانیشدا سەلیم بەرەکات نووسەرێکی گەورەیە، بەڵام چونکە خاوەنی ئەو زمانە قورسەیە، بووەتە هۆی ئەوەی بۆ زمانەکانی تر تەرجەمە نەکرێت، کاتێک تەرجەمەش دەکرێت ئەو جوانکارییە نادۆزرێتەوە کە لە تێکستە ئەسڵییەکەدا هەیە، لەبەر ئەوە بە درێژایی مێژووی ئەدەب کۆمەڵێک نووسەر هەن دەبن بە قوربانیی ئەو زمانەی پێی دەنووسن. وەک چۆن هەندێک نووسەری سادەش زۆر سوود لە ئاسانیی زمانەکەیان دەبینن بۆ وەدەستخستنی ناوبانگێکی زۆر، کە زۆرجار شایستەی نین، بە بڕوای من پاولۆ کولیۆ یەکێکە لەوانە. لە ئەدەبیاتی ئەڵمانیا پۆڵ سیلان شاعیرێکی زۆر گەورەترە لە برێخت، بەڵام وەرگێڕانی شیعری ئەم شاعیرە بۆ زمانەکانی تر نامومکینە و تەرجومە ناکرێت، لەکاتێکدا شیعری برێخت سادە و سووکەدەستە... بە کورتی ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی جیهانییە، تا

بە درێژایی مێژووی ئەدەب کۆمەڵێک نووسەر هەن دەبن بە قوربانیی ئەو زمانەی پێی دەنووسن. وەک چۆن هەندێک نووسەری سادەش زۆر سوود لە ئاسانیی زمانەکەیان دەبینن بۆ وەدەستخستنی ناوبانگێکی زۆر، کە زۆرجار شایستەی نین، بە بڕوای من پاولۆ کولیۆ یەکێکە لەوانە





مرۆڤەکانیش زیاتر روو لە ئەدەبیاتی سادە بکەن گرفتەکە قووڵتر دەبێتەوە. بە گشتی خوێنەری ئەم سەردەمە حەزی لە ئەدەبێکی سادەیە بە هەندێک هەوا و نەفەسی شاعیری و سیحرییەوە، ئەوە کاری ئەدەبیاتی جیدی زۆر قورستر دەکات.

***تۆ قبوڵتە و لات ئاساییە هەر بەو زمانە شیعرییە بنووسیت و لە ئەنجامدا ببیتە یەکێک لە قوربانییەکان؟**

-وەک وتم زۆر بە کەمی بیر لە پرۆسەی وەرگێڕان دەکەمەوە، بەڵام راشم وایە دیوێک هەیە لە تێکستی مندا قابیلی وەرگێڕانە، ئەویش هەم دیوە فکری و هەم ڕەهەندە حیکایەت ئامێزەکەیەتی، کە تەژییە بە کاراکتەر و رووداو. ئەم دیوە قابیلی وەرگێڕانە، رەنگە تەرجەمەی شیعرەکانم سەخت بێت، بەڵام رۆمانەکانم سەرباری ئەوەی قورسن، بەڵام ئەستەم نین. تەرجەمە کردنی سەلیم بەرەکات بۆ هەر زمانێکی تر بە سەخت دەزانم، بەڵام تیکستەکانی من لەو ئاستە سەختەدا نین کە گەیاندن و وەرگێڕانی مەحاڵ بێت. ئەگەر لە تێکستەکانمدا رەهەندێکی ئاسان نەبوایە زۆر زەحمەت بوو لەناو خەڵکی سادەدا بخوێنرابایەتەوە. بۆیە کێشەکە لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە کورد وەرگێڕی کەمە.

***هەندێک لە کارەکانت وەرگێڕدراونەتە سەر چەند زمانێک، خۆت تا چەند لەو وەرگێڕانانە رازییت و تا چەند توانراوە بە شێوەیەکی باش و سەرکەوتوو بگەنە ئەو زمانەی بۆیان وەرگێڕدراوە؟**

-ئەوەی کە تائێستا چاپ بووە وەرگێرانی رۆمانەکانە بۆ فارسی. من وەرگێرانەکانم نەخوێندووەتەوە، خۆم رای جیاواز لەسەریان دەبیستم، هەندێک پێیان باشە و هەندێک خراپ. شاری مۆسیقارە سپییەکان کە کراوە بە فارسی، هەر وەک کتێب نەمدیوە، دواهەمین هەناری دونیاش هەروەها. واتە هەتا وەک کتێبیش نەمگرتوون بەدەستمەوە. زۆر لە وەرگێڕەکان پرسیان پێ نەکردووم کە بڵاویان کردووەتەوە تاکو بتوانم هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەم و بزانم چۆن کراون.

***لە شوێنێک ئاماژەت بۆ خوێنەر کرد و باست لەوە کرد کە رۆمانەکانت لە هەموو ئاستەکاندا خوێنەریان هەیە، بەڵام لەناو خودی خوێنەرەکانتا بۆچوون و خوێندنەوەی جیاواز و دوور لە یەک هەیە، هەندێکیان پێیان وایە کارەکانت لە ئاستی رۆمانە گەورەکانی دنیادایە و جاری وا هەیە دەگوترێ بەختیار عەلی شایستەی خەڵاتی نۆبڵە، هەندێکی تر پێیان وایە رۆمانەکانت تەنانەت شایەنی خوێندنەوەش نین و ئەوە ناهێنن خوێنەر کاتی خۆیان پێوە بکوژێ!. تۆ خۆت لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەدا رات چییە و چی دەڵێیت؟**

-هەموو تێکستێک جۆرێک خۆشەویستی و نەیاریش درووست دەکات. بە رای من هەق نییە بە هیچ تێکستێک بوترێت شایەنی خوێندنەوە نییە، تەنیا ڕەخنەگری زۆر ئەحمەق ئەو مافە بەخۆی دەدات بۆ هەمووان بڕیاربدات. تێکستی بێبایەخ یان مرۆڤ باسی ناکات یان بە خوێنەر دەڵێت بڕۆ بیخوێنەوە و زانیاری و زەوقی خۆت بکەرە پێوەر، لەوە دەرچوو مرۆڤ دەبێت قسەی زۆر جیدیی هەبێت بۆ رەتکردنەوە و قەبووڵکردنی تێکستێک. پرسیارەکە لای من ئەوە نییە ئەگەر تەرجومە بکرێم بۆ رۆژئاوا چەند ناوبانگ پەیدا دەکەم و چەند خەڵات وەردەگرم، یان لەمڕۆدا ژمارەی دۆست و نەیارەکانم چەندن. خەڵکێک هەیە شکسپیر و دۆستۆیڤسکی بە نووسەر

# کتێب هێزێك و سیحرێکی هەیە هەم لە دیوارەکانی جەهل و هەم لە بەربەستەکانی شەڕانگێزی بەهێزترە

نازانن. خۆت دەزانیت من چەندە ڕۆماننووسم، هێندەش باسکار و ڕامێنی ئەدەبیاتم، چەندەم تێکستی ئەدەبی نووسی بێت، هێندەش تێڕامانی تیۆریم بۆ ئەدەبیات بووە، بە کورتی من خۆم خوێنەرم بەر لەوەی نووسەر بم. هیچ نووسەرێک لە سات و سەردەمی خۆیدا بە دروستی هەڵسەنگاندنی بۆ ناکرێت، هەڵبەت ناوبانگ لە سەردەمی خۆتدا گرنگە، بەڵام ناوبانگ شەهادەیەکی ئەدەبی نییە. ئێمە ئەمڕۆ نووسەرمان هەیە زۆر بەناوبانگە، بەڵام ئەدەبیاتەکەی شتێکی بێمانا و سەتحی و هوتاڤییە. شەڕی گەورەی تێکست لەگەڵ یار و نەیارانی ئێستادا نییە، بەڵکو بە دیوێک لەگەڵ مێژووی ئەو جنسەدایە کە تیایدا دەنووسین، بە دیوێکی تریشدا لەگەڵ داهاتوودایە.

من کوڕی کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووم، لە شارێکدا لەدایکبووم لە بێبایەخترین و پەراوێزترین شارەکانی دونیا، لە نەتەوەیەکدا کە تیراژی کتێب زۆربەی کات لە پێنجسەد نوسخە تێناپەڕێت، لەو پێنجسەد نوسخەیە سەدی ناخوێندرێتەوە، لەو سەدە پەنجای خوێنەر تێی ناگات، لەو پەنجایە دەی تەنها توانای دروستکردنی ڕای خۆی هەیە، لەو دەیەش ڕەنگە هیچیان نەتوانن بە نووسین بۆچوونی خۆیان دابڕێژن، ئێمە لە فەزایەکی وەهادا ئیشدەکەین، بۆیە لە جێگەیەکی وەهادا چاوەڕوانی ئەوە نیم کە هەمووان تێم بگەن، هەمووان ستاتیکا و مانا و دەلالاتی پشت تێکستەکانم بخوێننەوە. نووسەر بەر لە هەر شت دەبێت بزانێت لە کوێدا دەنووسێت، لە چ کۆمەڵگەیەکدا. جگە لەوە کۆمەڵگەی ئێمە لە پاڵ نەخوێندەواریدا، کۆمەڵگەیەکی شەڕانگێزە، نیوسەدە جەنگی بەردەوام، مۆراڵی ئینسانی ئێمەی وێرانکردووە، نیو سەدەیە ئایدۆلۆژیا دینی و ناسیونالی و مارکسییەکان شەڕانگێزییەتی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی دروست دەکەن، عەقڵییەتی میکانیکی و تەسک دروست دەکەن، مرۆڤێک دروست دەکەن پڕە لە حوکمی پێشوەخت، ئینسانێک تەنیا بە هەڵچوونە عاتیفییە خێراکانی بڕیار دەدات.

من بە موعجیزەی دەزانم کە کتێبێکم دەبینم لە ماوەی پێنج شەش ساڵدا بیست هەزار نووسخەی لێ دەخوێنرێتەوە. چۆن هەندێک کتێب دزە دەکەنە ناو ئەو قەڵا ترسناکەی شەڕانگێزی و جەهلەوە، ئەوە بۆ خۆی شتێکی گەلەک سەرنجڕاکێش و سەرسوڕهێنە. کتێب هێزێک و سیحرێکی هەیە هەم لە دیوارەکانی جەهل و هەم لە بەربەستەکانی






هیچ نووسەرێک لە سات و سەردەمی خۆیدا بە دروستی هەڵسەنگاندنی بۆ ناکرێت، هەڵبەت ناوبانگ لە سەردەمی خۆتدا گرنگە، بەڵام ناوبانگ شەهادەیەکی ئەدەبی نییە. ئێمە ئەمڕۆ نووسەرمان هەیە زۆر بەناوبانگە، بەڵام ئەدەبیاتەکەی شتێکی بێمانا و سەتحی و هوتاڤییە



شەڕانگێزی بەهێزترە. کتێب ئەو هێزە لە کوێوە دەهێنێت؟ نازانم! هێندە هەیە دەزانم موعجیزەیەکی بێوێنەیە کە دەبینم کتێبی باش دەتوانێت بە ئەندازەی هێزی جەهل بەهێزبێت و بیشکێنێت و بڕوات و بژی و بمێنێتەوە. هیچ موعجیزەیەک لەوە گەورەتر نییە لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو و شەڕانگێزی وەک ئێمەدا کتێبێک بتوانێت بژی... ئەوە لای من هەمیشە موعجیزەی موعجیزەکان، شای موعجیزەکان بووە. لەوە بترازێت زەمەن حاکمی مەتڵەقە بەسەر مان و نەمانی ئەدەبیاتەوە. زەمەن، کتێب لە پیاهەڵدانی درۆزنان و شێواندنی بوغزنان دەپارێزێت. زەمەن، بڕیار لەسەر نەمری دەدات، نەک من و تۆ. جەلالەدینی ڕۆمی لە سەردەمی خۆیدا رەنگە ژمارەیەکی زۆر کەم خەڵک ناسیبێتیان، بەڵام دوای سەدان ساڵ دەبێتە یەکێک لە شاعیرە زۆر خوێنراوەکانی دونیا، بەتایبەت لەسەر ئاستی زمانی ئینگلیزی. ئەوەی لای من گرنگە و دەمەوێت پێی بگەم، ئەوەیە تێکستەکانم لە پاشەڕۆژدا بخوێنرێنەوە، ئەو نەوەیەی لە دوای ئێمەوە دێن بیانخوێننەوە و مانایان تێدا بدۆزنەوە، کتێبێک بن بۆ پاشەڕۆژیش. کتێب کاتێک دەبێتە نەمر، کە شتێکی تێدا بێت سەردەمەکانی تر نەتوانن بازی بەسەردا بدەن، بۆ نموونە هاملێت بۆ من هاوچەرخە، لە زۆربەی پاڵەوانەکانی ئەدەبی کوردی هاوچەرخترە. ئارەزووی گەورەی من ئیشکردنە بۆ پاشەڕۆژ، نەک بۆ شورەتی ئەمڕۆ. ئەوەش پرسیارێکە من لە تەمەنی خۆمدا وەڵامەکەی نابینمەوە. تراژیدیای نووسین ئەوەیە، وەختێک دەسکەوتە گەورەکانی دێنە پێشەوە، ئەو کات تۆ لەوێ نیت. نە هۆمیرۆس، نە سۆفۆکلیس، نە سێرڤانتس، نە شکسپیر... خۆیان نەیانزانیوە چەند نەمرن، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە دەزانین. هەم نەفرەتی زۆر و هەم ستایش و چەپڵەی بێ ئەساس نووسەر دروست ناکەن، بۆیە کەم تا زۆر ئەو جۆرە دابەشبوونەم زۆر بۆ گرنگ نییە، کە یەکێک دەبینم قسە لەسەر تێکستێکم دەکات، بەر لەوەی بیر لەوە بکەمەوە چی لەسەر من یان تێکستە دەڵێت، سەیری ڕۆشنبیریی دەکەم، لەو پاشخانە فەرهەنگییە دەڕوانم، کە لە پشت قسەکانەوەیە... ئەوە گرنگ نییە چی دەڵێت، ئەوە گرنگە لەسەر چ خەزینێکی مەعریفی و ستاتیکی ئەم بۆچوونەی دروست کردووە. کتێب وەک خواردن و خواردنەوە نییە بتوانێت لەسەر خوان دابنیشیت و بڵێیت بە دڵم بوو یان بە دڵم نەبوو. بۆ ئەوەی کتێبێکت بە دڵ بێت یان بە دڵت نەبێت، پێویستت بە ئەزموونێکی فیکری و ڕۆشنبیریی زۆر هەیە. من تا ئێستا زۆر بە زەحمەت دەوێرم بە ڕەهایی بڵێم کتێبێکم بە دڵە یان نا... دەخوێنمەوە و هەوڵ دەدەم لێوەی فێربم، بەڵام ئەوەی بخوێنمەوە بۆ ئەوەی حوکم دەربکەم، ئەوە نا.. ئەوە ڕەنگە ئەزموونێکی گەورەتری لە ئەزموونی من پێویست بێت. زۆرجار هەست دەکەم ئێمە خوێنەرمان نییە، بەڵکو حاکم و قازی و دادوەری تەفتیشمان هەیە، داوەرێکی نەخۆش، کە زۆربەی گرێ دەروونی و نەخۆشییە شەخسییەکانی خۆی دەخاتە ناو خوێندنەوەوە، خوێندنەوەی کردووە بە جێگەی بەتاڵکردنەوەی کینەی خۆی بەسەر ژیان و نووسین و زمان و ئینساندا... من بۆ خۆم هیچ کات لەوانە نەترساوم، تێیان گەیشتووم و بەلایاندا ڕابوردووم و هیچم نەوتووە، چونکە دەزانم مان و نەمانی من

# تراژیدیای نووسین ئەوەیە، وەختێك دەسكەوتە گەورەكانی دێنە پێشەوە، ئەو كات تۆ لەوێ نیت

وەک نووسەر لە جێگەیەکی تردایە... ئەوەی ئەو جۆرە خوێنەرانە ئەناتۆمی «تشریح»ی دەکەن، دەروونی خۆیانە، نەوەک کتێبەکان.

**وتت ئەوەی بەلاتەوە گرنگە ئیشکردنە بۆ ئەوەی لە سەردەمێکی تردا بخوێنرێیتەوە و تێکستەکانت بە زیندوویی بمێننەوە لای خوێنەر، واتە زیندوویی کارەکانت لای خوێنەری سەردەمانێکی تر گرنگە بەلاتەوە نەک خەڵات و ناوبانگی ئێستا، بەڵام هەر خۆت لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێیت کاتی نووسین ئەوەی بیری لێ ناکەمەوە لە کاتی نووسیندا و بەلامەوە گرنگ نییە (خوێنەرە)!. ئەم قسەیەی ئێستات پێچەوانەی ئەوە نییە، کە پێشتر وتووتە و ئەمە دوو رای دژ بە یەک نیین؟**

-هەمیشە خەیاڵم لای خوێنەرێکی ئیدیالە، چونکە خوێنەرێکە رەنگە هیچ خوێنەرێکی واقیعی ئەم سیفەتانەی تێدا نەبێت، خوێنەرێکی زیرەک کە لە تێکستەکە تێدەگات و بە پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی ناو تێکستەکە هاوکاریی نووسەر دەکات، لەبەر ئەوە لە خەیاڵی هەموو نووسەرێکدا ئەم خوێنەرە نموونەییە هەیە. خوێنەرێکی دەرەکات و دەرەشوێنە. خوێنەرێکە دەشێت ئێستا و لێرە لەسەر هەر شەقامێکدا ڕێکەوتی بکەین، یان لەوانەیە لە سەردەمێکی تردا بژی. ئەو خوێنەرەی من بۆی دەنووسم خەڵکی ئێرە و ئەم ساتە نییە، بەڵکو خەڵکی هەموو شوێنەکان و سەردەمەکانە، بوونەوەرێکی لۆکاڵ و شارنشین و ئێستەگەرا نییە، بەڵکو بوونەوەرێکی یونفرسال و گەڕۆک و زەمەننەناسە. خوێنەر لای من بوونەوەرێکی ئیفترازییە نەوەک واقعی، ئەوەی بیری لێ ناکەمەوە ئەو خوێنەرە واقعییەیە کە مەحکومە بە سەدان کۆت و پێوەند و کاتێک کتێبێک دەگرێت بە دەستییەوە، بە هەموو ئەو پاشخانە گرێدار و دەروونییەوە دەیخوێنێتەوە، کە دەبن بە دیوار لە نێوان ئەو و تێکستدا. من دڵنیاشم سێبەری ئەو خوێنەرە یونفرسال و هەمیشەییە بە کاڵی لە ناو زۆر زۆر خوێنەری ئاساییدا هەیە، کە هێشتا سیاسەت و کینە و غەریزەی تێکشکاندنی تێکست نەیشێواندوون.

**ژن لەناو رۆمانەکانی تۆدا شوێنی زۆر گەورەی هەیە و رۆڵیان هەیە لەناو گۆڕانکارییەکانی ژیاندا، هەندێک لەو ژنانە لەناو کوردستاندا گەورە نەبوون و پەروەردەی دەرەوەی کوردستانن، بۆ نموونە (دالیای سیراجەدین و سەوسەن)، کە پەروەردەی شاری بەغدان. پرسیارەکە ئەوەیە، شوێن چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر دروستبوونی ئەو کاراکتەرە ژنانە؟ ئەگەر ئەو کاراکتەرانە لەناو کوردستاندا بوونایە نەیاندەتوانی ئەو رۆڵە گەورەیان هەبێتە و ئەو کاریگەرییە قورسە دابنێن، کە ئێستا هەیانە؟**

-زۆربەی کاراکتەرەکانم فاسیلەیەکیان لە ژینگەی خۆیان پێویستە، تەنانەت کاراکتەرە پیاوەکانیشم، کە لە کۆشکی باڵندە غەمگینەکاندا دەڕۆن و سەفەر دەکەن بە دوای ئەو فاسیلەیەدا لە واقیعی خۆیان دەگەڕێن. سەوسەن کە عاشقەکانی دەنێرێت بۆ دوور، لە خۆیان دوورناخاتەوە، بەڵکو لەو جیهان و دونیا سنوردارە دووریان دەخاتەوە کە ژیان و بیرکردنەوەی لەقاڵبداون. ژنی کورد لە پیاو زیاتر پێویستی بە فاسیلە لە واقع هەیە، نە بۆ ئەوەی ئازاد بێت، بەڵکو بۆ ئەوەی ڕۆشنتر لە خۆی تێبگات. ببینە، ئەگەر دالیا لە دەرەوەی کوردستان نەبایە،



هیچ موعجیزەیەک لەوە گەورەتر نییە لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو و شەڕانگێزی وەک ئێمەدا کتێبێک بتوانێت بژی... ئەوە لای من هەمیشە موعجیزەی موعجیزەکان، شای موعجیزەکان بووە. لەوە بترازێت زەمەن حاکمی مەتڵەقە بەسەر مان و نەمانی ئەدەبیاتەوە. زەمەن، کتێب لە پیاهەڵدانی درۆزنان و شێواندنی بوغزنان دەپارێزێت. زەمەن، بڕیار لەسەر نەمری دەدات، نەک من و تۆ



زەحمەت دەبوو ئەو جوانییە ڕۆحی و جەستەیی و ئینسانییە دەربخات، بەڵام گەر بە گشتی بڕوانیت، زۆربەی پاڵەوانەکانی من پێویستیان بە شوێنێکی تر هەیە. پەروانە، فەرەیدونی مەلەک، سەریاسەکان، جەلادەت، ماجیدی گوڵ سۆلاف، جەمشید خان... هەموو پێکڕا بەردەوام بۆ جێگەیەکی تر دەگەڕێن. هەموو لە ناو خودی واقعدا و لە جێگەی خۆیانەوە بە چنگ سەردابێک هەڵدەکەنن بۆ ئەوەی جیهانێک دروستبکەن لە دونیای واقعی نەچێت. دالیا گەر لە ماڵی براکانیدا بمایایەتەوە، دەبوو لەناو ئەو بیرەدا بخنکایە کە خستیانە ناوی، بۆیە ڕزگارکردنی ژنی کورد لە ژینگەی ئێمەدا و دروستکردنەوەی کارەکتەری لە دەرەوەی ئەو ژینگەیە، جۆرێکە لە پەیامی ناڕازیبوون و تووڕەیی دەرهەق بەو واقیعەی لە کوردستاندا بۆ هەموومان و بەتایبەت بۆ ژن دروست بووە. سەوسەنیش ڕاستە لە ماڵی خۆی نایەتە دەرەوە، بەڵام ئەویش لەناو کتێبدا ژینگەیەکی تایبەتی دەسازێنێت. کتێبخانەکەی سەوسەن جێگەیەک نییە ئاوێنەی ژینگەی واقیعی ژنی کوردی بێت، بەڵکو ئەویش سەمبولێکی ڕاکردنە. لە کەشتیی فریشتەکانیشدا ڕێزانی مەلەکبین دوو ژیانی هەیە، ژیانێکی ئاسایی سادە، کە مامۆستایە لەگەڵ ژیانێکی دی لە کەشتیی فریشتەکاندا، کە تەواو جیاوازە لە ژیانی یەکەمی لە واقعدا. کەرتبوونی ئافرەتی کورد لە نێوان دوو ژیان و دوو ژینگەدا بۆ ئەوەیە تا پیشانی بدەینەوە ئەم مرۆڤە لە دەرەوەی ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییە سەرکوتکەرەدا دەتوانێت مەخلوقێکی تر بێت.

***باسی ئەوەمان کرد، کە ژن ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەری لەناو کارەکانی تۆدا هەیە، بەڵام زۆر جار ژنان قسەیەک دەکەن و پێیان وایە پیاو ناتوانێت ڕوئیا و دونیابینی و خەونەکانی ژن بگوێزێتەوە و ئەوەشی دەیگوێزێتەوە تەنها تێڕوانین و دونیابینییەکی پیاوانەیە و ئەوەی حوکم دەکات و بیر دەکاتەوە پیاوە نەک ژن. ئەم قسەیە تا چەند بە هەق و ڕەوا دەزانیت؟**

-من ئەدەبی ژن و پیاویشم خوێندووەتەوە، هەست ناکەم تا ئێستا هیچ ژنێک توانیبێتی هێندەی تۆلستۆی (ئانا کارینا)یەک دروست بکات و بە هەمان دیقەت و وەسفی وردەکارەوە دنیای ڕۆحی و فیکری و عەقڵی و ئەخلاقیی ئافرەت بگوازێتەوە. بە بێ ئەوەی لە نرخی هیچ ژنێک کەم بکەمەوە، تا ئێستا هیچ ژنێکم نەبینیوە وەک فلۆبێر (مادام بۆڤاری)یەک دروستبکات. کەم پیاویش هەیە وەک ئەمیلی برۆنتی بتوانێت کاراکتەرێکی شاعیری و زیندووی وەک هاتکلیف بخولقێنێت. خودی بۆچوونەکە بۆچوونێکی زۆر هەڵەیە،. ژن دەتوانێت کاراکتەری پیاوی هەبێت جوانتر لە هەر نووسەرێکی پیاو و بە پێچەوانەشەوە، بۆ نموونە (فێرجینا وۆڵف) نووسەرێکی گەورەیە، بەڵام ئیشی ئەو وەک ئافرەت ئەوە نەبووە نهێنیی ڕۆحی ژن و سیفاتی کاراکتەری ژنمان بۆ بگوازێتەوە، مەرج نییە ئەدەبێک کە ژن نووسیی ئیتر بتوانێت هەقیقەتی ژن و عەواتیفی ژنمان بۆ بگوازێتەوە، ئەوەشی پیاو نووسیی دونیای پیاومان بۆ بگوازێتەوە. ئەوە تێگەیشتنێکی میکانیکی و پێکەنیناوییە. ئەگەر وا بوایە دەبوا ژنەکان هیچ کاراکتەرێکی جوانی پیاویان نەبایە، لەکاتێکدا لای ڕۆماننووسانی وەک مارگرێت میتشل، جین ئۆستن، ئەمیلی برۆنتی کەسایەتیی پیاوەکانیان بە هەمان

ئەندازەی کەسایەتیی ژنەکانیان جوان.

***کە (جەمشید خانی مامم)ت نووسی باسی ئەوەت کرد، ئەم ئەزموونە وەکو تەحەدایەکی خۆت بووە بۆ ئیشکردن لە کاری بچوکتردا و تاقیکردنەوەیەکی خۆت بووە لەو بوارەدا، کەچی دوای ئەو ئەزموون و تاقیکردنەوەیە، بەر گەورەترین ڕۆمانی تۆ کەوتین، کە تەنها بەشی یەکەمی ٩٠٠ لاپەڕەیە، ئایا پێت وایە لە ئەزموونە بچوکەکەدا شکستت هێنا و ناتوانی تێکستی بچووک بنووسی، بۆیە (کەشتیی فریشتەکان) بەدوای ئەودا هات؟**

-پرۆژەی نووسینی (کەشتیی فریشتەکان) دەگەڕێتەوە بۆ پێش (جەمشید خان). من لە کاتی نووسیندا بۆ ساتێک بیرم لەوە کردەوە ئاخۆ دەتوانم نۆڤلێتێکی جوان بنووسم وەکو ئەوەی مارکیز لە یاداشتی سۆزانییە غەمبارەکەمدا نووسیویەتی یان شتاینبک لە مراوریدا یان تۆماس مان لە مردن لە ڤینیسیا یان دۆستۆیڤسکی لە شەوە سپییەکاندا؟ حەزم لەوە بوو تێکستێکی کورت بنووسم، هەڵگری ئەو سیفەتە جوانکارییانە بێت. ئایا وەکو نووسەر قودرەتم تەنها ئەوەیە لە ڕووبەری گەورەدا ئیش بکەم؟ ئایا کاری میناتۆریم لەدەست نایەت؟ ئایا دەکرێت لە ڕووبەرێکی کورتیشدا بە کەمترین بڕ لە وشە و ڕستە و کەمترین بڕ ڕووداو و کاراکتەر و دیالۆگ ڕۆمانێک بنووسم؟ جەمشید خان بەرهەمی ئەو هەوڵە بوو. مەسەلەکە ئەوە نییە شکستم هێنابێت لە جەمشید خاندا بۆیە ڕۆمانی درێژ دەنووسم، بە پێچەوانەوە بۆ من جەمشید خان ئەزموونێکی هەم سەرکەوتوو و هەم خۆشیش بوو. ئەوەی بمەوێت ستایلی خۆم وا لێ بکەم تا ئەبەد وەک جەمشید خان بنووسم، نا ... ڕەنگە زەحمەت بێت. دیارە دەمەوێت تێکستی کورت بنووسم، ڕەنگە لە داهاتوودا ئەزموونێکی لەو شێوە دووبارە بکەمەوە، چونکە پێم وایە ڕۆمانی کورت جۆرە ئیستاتیکایەکی تایبەتی هەیە، جیاوازە لە ڕۆمانی درێژ، تەنانەت هەندێک جار







**بەختیار عەلی و گۆران بابەعەلی، گوندی سیاگوێز**

وەک دوو جنسی ئەدەبیی جیاواز دێنە بەرچاوم. هەست ناکەم دژی یەک بن، بەڵام هەستیش ناکەم تەواوکەری یەکتر بن. جەمشید خان کورتکراوەی رۆمانەکانی ترم نییە، بەڵکو ئەزموونێکی ترە.

***پێشتر باسی ئەوەت کردووە کە زۆر سەرسامیت بە کورتە چیرۆکنووسە جوانەکان و هونەری نووسینی کورتە چیرۆکت لا کەمتر نییە لە هونەری نووسینی رۆمان، باسی ئەوەشت کرد، کە خۆت تاقی نەکردووەتەوە ئایا ئەتوانیت چیرۆکی کورت بنووسیت یان نا.. بۆچی تاقیت نەکردووەتەوە؟**

-هەرچەند بیر لە ئایدیایەک دەکەمەوە بیکەمە کورتە چیرۆک، دواجار تەماشادەکەم لە رۆماندا تەواو دەبێت، رەنگە تاکە هۆکارێکی ئەوە بێت کە بە قورسی دەتوانم جڵەوی خەیاڵی خۆم بکەم. هەرچۆنێک بیگرم خۆی بەرەو ئەوە دەڕوات پەڕوباڵی تر و چیرۆکی تر لە خۆی بکاتەوە. لای من هەرگیز چیرۆکێک بە تەنیا نایەت، ئەوە موسیبەتی گەورەی رۆماننووسەکانە، کە چیرۆکەکان بە تەنیا روویان تێناکەن. ئەوە فەزڵێکە نووسەرانی کورتە چیرۆک بەسەر رۆماننووساندا هەیانە.

***سەرەتای نووسینی کارێکی نوێ لە نووسەرێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە و هەریەکەیان بە جۆرێک دەست پێدەکات و بڕیاری نووسین دەدەن، واتا هەر نووسەرەی تایبەتمەندیی خۆیی هەیە بۆ سەرەتای کارێکی نوێ. ئەم حاڵەتە لای تۆ چۆنە و سەرەتا و بڕیاردان بۆ دەستکردن بۆ نووسینی کاری نوێ بە چ جۆرێکە؟**

-هەندێجار سەرەتا تەنیا وێنەیەکە، بەڵام هەندێجاری

# پرۆسەی بەواقعیکردنی خەیاڵ لە نووسیندا پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، کە ئەستەمە تێیدا خەیاڵ وەك خۆی بمێنێتەوە

دیش دوای ئەزموونێکی درێژی نووسین و چاککردن و دەستپێکردن و فرێدان دەگەمە ئەو سەرەتایەی دەمەوێت. سەرەتا هەمیشە ئەزموونە، زۆرجار دەست پێدەکەیت و نازانیت ئاخۆ ئەوە سەرەتا ڕاستەکەیە یاخود نا. من لێتی ناشارمەوە هەندێجار سەرەتا لە کۆتاییدا دەنووسم، ئەمە بەو مانایە نییە کە سەرەتایەکم نییە، هەمیشە سەرەتاییەکی یەکەمین هەیە، بەڵام هەندێجار وای لێدێت دەکەوێتە ناوەڕاست یان کۆتاییەوە. مێژووی بیرۆکەی ڕۆمان جیاوازە لە مێژووی نووسینی، ئەوەشی دواجار وەک تێکست دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەر، شتێکە جیاواز لەو دوا فۆرمەی لە خەیاڵی نووسەردا بووە. گۆڕینی خەیاڵ بۆ تێکست، یان فیکرەی ئەدەبی بۆ تێکست، هەمیشە کارێکی نیوەناچڵە، چونکە هیچ کات تێکست یان زمان ناتوانن تەواو بکەونە خزمەتی بیرۆکەی یەکەم یان خەیاڵی سەرەتایی تێکستەوە... پرۆسەی بەواقعیکردنی خەیاڵ لە نووسیندا پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، کە ئەستەمە تێیدا خەیاڵ وەک خۆی بمێنێتەوە.

***مەبەستی پرسیارەکەی من ئەوە نەبوو، مەبەستم ئەوەیە کە بیرۆکەی کارێک لە مێشکتدا دروست دەبێت یەکسەر دەست ئەکەی بە کارکردن، یان تەواوی کارەکە دروست دەکەیت لە مێشکتدا و کۆتایی پێ دێنی، ئەوسا دەست دەکەی بە نووسینی؟**

–دەبێت کۆی ڕۆمانەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە خەیاڵمدا بێت، واتە داڕشتنێکی سەرەتاییم هەبێت، وەک چۆن مامۆستایەک وانەیەک دەڵێتەوە و لە سەرەتای ساڵەوە سەری بابەتەکانی لایە و دەزانێت دەبێت لەسەر چ تەوەرێک ئیشبکات، گەر وانەبێت ناتوانم دەست پێ بکەم. ئەگەر هەموو بیرۆکەکە لە مێشکمدا نەبێت، ناتوانم ئیشبکەم، بەڵام لە کاتی ئیشکردندا شتەکان حەتمەن ڕەوتێکی تر وەردەگرن. ڕۆماننووسین لە سەفەرێک ناچێت بە فڕۆکە لە خاڵێکی دیاریکراوەوە دەست پێبکەیت و بگەیتە خاڵێکی دیکە، بێ ئەوەی بە جێگەیەکی تردا بڕۆیت. ڕۆماننووسین سەفەرێکی درێژە بە خاکێکی پڕ مەترسیدا و بە پێ، لێرەوە مرۆڤ ناچارەبێت بەردەوام ڕێگەی خۆی بگۆڕێت، لە زۆر جێگە زیاتر بمێنێتەوە لەوەی پلانی بۆ کێشاوە، هەندێ کەس دێنە ڕێگەی لە نەخشەی یەکەم و بەرنامەی سەرەکیدا نەبوون، کە بیانبینێت، هەندێک ڕووداوی تووش دێن، کە چاوەڕوانی نەکردوون. ئەوە وادەکات فۆرمی ئەو نەخشە سەرەتاییە بەردەوام بگۆڕێت، گەرچی سەرەتا و کۆتایی لای من زۆرجار وەک خۆیان دەمێننەوە. بەشی هەرەزۆری گۆڕانکارییەکان لە ناوەوەن، لە ناوەڕاستی تێکستدان. لە هونەری ڕۆماننووسیندا گرنگ ئەوەیە لە سەرەتاوە کۆتایی بزانیت چییە. ڕۆمانی خراپ ئەو ڕۆمانەیە نووسەرەکەی لە سەرەتاوە کۆتاییەکەی نەزانێت، چونکە ئەوە تووشی شپرزەیی و بێپلانی و پەرتبوونی دەکات. گرنگترین شت لای من زانینی کۆتاییە، گەر ئەوەت زانی ئیتر ئازاد دەبیت چ ڕێگەیەک هەڵدەبژێریت بۆ ئەوەی بگەیتە ئەو کۆتاییە، دوای ئەوە ئیتر گەڕیدەیەکی ئازادیت، ترست لەوە نییە لە جێگەیەکدا بچەقیت و نەجوڵێیت.

***وتت کە دەمەوێ ڕۆمانێکی نوێ بنووسم، ئەبێ تەواوی ڕۆمانەکە لە مێشکمدا دابڕێژم، ئەوسا دەست ئەکەم بە نووسین و ئیشکردن لەسەری،**



ڕۆماننووسین سەفەرێکی درێژە بە خاکێکی پڕ مەترسیدا و بە پێ، لێرەوە مرۆڤ ناچاردەبێت بەردەوام ڕێگەی خۆی بگۆڕێت، لە زۆر جێگە زیاتر بمێنێتەوە لەوەی پلانی بۆ کێشاوە، هەندێ کەس دێنە ڕێگەی لە نەخشەی یەکەم و بەرنامەی سەرەکیدا نەبوون، کە بیانبینێت، هەندێک ڕووداوی تووش دێن، کە چاوەڕوانی نەکردوون



**بەڵام ئەوەندەی من بزانم جاری وا هەیە لە یەک کاتدا ئیش لە دوو ڕۆمان و زیاتریشدا دەکەیت، بیرۆکە و ڕووداو و کاراکتەری ئەو کارانە چۆن تێکەڵ نابن و ناپەڕنەوە بۆ ناو یەکتری؟**

-من پێم وایە ئەمە ئەزموونێکی باشە، جاری وا هەیە پاڵەوانێک لە تێکستێکەوە دەپەڕێتە ناو تێکستێکی تر و لە ماڵێکی تردا جێگەیەک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. دکتۆر مستەفا شکاک لە کەشتیی فریشتەکاندا پاڵەوانی تێکستێکی تر بوو، بەڵام لەم ڕۆمانەدا ڕۆڵێکی ئۆرگانیی هەیە. نووسەر دەبێت کارخانەیەکی دروستکردنی کاراکتەری هەبێت. ئەو تێکستانەی دەیاننووسم بەشێکن لە ئیشکردنی من لەو کارخانەیەدا، کارخانەیەکی سەرەتایی کە پاڵەوان و قارەمان دروست دەکات. واتە بەر لەوەی چیرۆک دروست بکەیت، دەبێت کاراکتەر دروست بکەیت. ئەو تێکستە تەریب و هاوشانانە وەک کانگا وان بۆ وەرگرتنی مەتریاڵی خاو، بۆ مەشقکردن بە خەیاڵ، بۆ زیادکردنی توانای گێڕانەوە و دروستکردنی چیرۆک و سازدانی فەزای نوێ. ڕۆماننووسین وەک هەر یارییەکی تر پێویستی بە مەشقە، مەشقی درێژ.

***لە شوێنێک (مارکیز) باس لە کاراکتەری ڕۆمانێکی دەکات، دەڵێ حەزم نەدەکرد بمرێ، بەڵام هەر دەبوو بمرێ و مرد. لە ئیشی تۆدا حاڵەتی وا رووی داوە؟ حەز نەکەیت کاراکتەرێکت بمرێت، بەڵام مردبێ؟**

- (غەزەلنووس). ساتەوەختی کوژرانی (غەزەلنووس) بۆ خۆم بڕیارێکی سەختبوو، چونکە تا ئەو ساتەی دەکوژرێت، بیرم لێی نەکردبووەوە کە دەبێت ئێستا و لێرەدا غەزەلنووس بمرێت، بەڵام ساتێک دێت هەست دەکەیت ئەم کاراکتەرە وەزیفەی خۆی تەواوکردووە. خۆت دەزانیت مردنەکە مەجازییە، مردنەکە دەلالەتی ئەوەیە، کە پاڵەوانەکە کەم تا زۆر تەواوی ئەو پەیامەی هەیبووە گەیاندوویەتی و ئێستا تەنیا لە ڕێگەی مردنەوە دەتوانێت درێژە بەو پەیامە بدات. غەزەلنووس ئەگەر لەوێدا نەمرێت، زەحمەتە مانا و رۆحی ئەو پەیامەی لە سەرەتای تێکستەکەوە هێناویەتی بیگەیەنێت. غەزەلنووسێکی زیندوو هەمان ئەو هێزەی نییە کە ئیدی غەزەلنووسی مردوو هەیەتی. بۆ ڕۆماننووس زۆر گرنگە لەو ساتە تێبگات و بزانێت کام کاراکتەر بە مردوویی نرخی زیاترە لە زیندوویێتی. مردن بۆ خوێنەر مەسەلەیەکی عاتیفی و ڕۆحییە، بەڵام بۆ نووسەر مەسەلەیەکی تەکنیکی و هونەرییە. مارکیز لەوێدا باس لەو یاسا تەکنیکییانە دەکات کە ڕۆماننووس مەحکوم دەکەن کەسێک بکوژێت، ئەو یاسانەی کە زۆرجار جیاوازن لە یاسا عاتیفی و ئەخلاقییەکان.

***یەکێک لەو کاراکتەرانەی تۆ، کە من پێم ناخۆشبوو دەکوژرێت (سامیری بابلی)یە، ئەگەر من لە جێی تۆ بوومایە سامیری بابلیم نەدەکوشت... بۆچی کوشتت؟**

-ئەوە یەکێک بوو لە بڕیارە هەرە قورسەکانی ناو ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان)، ئەو ڕۆمانە زۆر وێستگەی تێدایە کە ئینسان پرسیار دەکات، پاڵەوانەکان دەبێت بە چ ڕێگەیەکدا بڕۆن؟ لە دوای ئەمە دەبێت چی بکەن و چی ڕووبدات؟ کوشتنی (سامیری بابلی) لە هەموو بڕیارەکان قورستر بوو، چونکە ڕۆحی تێکستەکە بەند بوو بە مان و نەمانی بابلییەوە. ئەگەر بابلی بمایایەتەوە مانای ئەوە

# بۆ رۆماننووس زۆر گرنگە لەو ساتە تێبگات و بزانێت کام کاراکتەر بە مردوویی نرخی زیاترە لە زیندووێتی

بوو ئێمە کۆمەڵگەیەکین ئەم هەموو توندوتیژییەی لەناوماندایە بەو تۆخییە دەرناکەوێت. تەواوی تێکستەکە لەسەر ڕیسواکردن و مەحکومکردنی ئەو توندوتیژییەی لە هەناوی کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە ڕاوەستاوە، بەڵام لە پڕێکدا تاوانبارێکی ناو تێکستەکە هەروا ئازادانە بەربێت، راستە لە رووی ئەخلاقی و ویژدانییەوە جوانە، بەڵام لە رووی فەلسەفەی گشتیی تێکستەکەوە، کە ئێمە کۆمەڵگەیەکین تا ئێستا تۆڵە و نەبوونی تۆلێرانس جڵەومان دەکات، زیانی کوشندەی دەبوو. من دەڵێم قوربانی مەرج نییە بەڕەحمتر بێت لە جەللاد. لە رێگەی کوشتنی سامیرەوە ویستم بڵێم توندوتیژی بەردەوامە و قوربانی دەتوانێ شوێنی جەللاد بگرێتەوە. بەداخەوە ئەو پێشبینییە دواتر بە جۆرێکی زۆر زۆر ترسناک لە عیراقدا هاتە دی.

***با بەشی دووەمی قسەی (مارکێز) تەواو بکەین، کە دەڵێ حەزم نەدەکرد فلان کاراکتەرم بمرێ، بەڵام مرد. دوای ئەوە دەڵێ: دوای مردنەکەی گریام... تۆ بۆ مردنی هیچ کاراکتەرێکت گریاوی؟**

-نا.. لە کاتی نووسیندا نەگریاوم، بەڵام مردنی (غەزەلنووس)م پێ ناخۆش بوو، پێشم وایە ئەگەر بە وردی بچیتەوە سەر ئەو چەند لاپەڕەیەی باسی کوشتنی غەزەلنووس دەکات و بەرخودی بارۆنی خەیاڵ لەگەڵ ساتەوەختەکەدا بخوێنیتەوە، هەست بەو ترس و غەمە دەکەیت. غەزەلنووس لای خۆم لە کاراکتەرە زۆر خۆشەویستەکانم نییە، بۆ نموونە من تەحەمولی جەلادەتی کۆتر یان سەوسەن فیکرەت یان جەمشید خان یان ماجیدی گوڵ سۆلاف زیاتر دەکەم، واتە ئەوانە گەر کاراکتەر و مرۆڤی زیندوو بوونایە، ڕەنگبوو نەتوانم هاوڕێی غەزەلنووس بم، بەڵام هاوڕێی مەنگوڕ یان نزار ئیدریس بم. غەزەلنووس ئایدیالیسترین کاراکتەری منە، زۆر ئایدیالیستە، زۆر زیاتر لە پێویست شاعیری و ئینسانییە، ئەوە وای لێ دەکات پتر لە پێغەمبەران بچێت، بەڵام جەلادەت بۆ نموونە وانییە. جەلادەت درۆزنێکی رۆحسووکە، دەتوانێت زیانبەخش و ئەنانیش بێت، یان سەوسەن زۆر توانایەکی گەورەی تێدایە ئەوانی تر بخاتە ئەزێت و ئەشکەنجە و ئازارەوە، یان وەفای رەفعەت بەگ لە کەشتیی فریشتەکاندا، شۆڕشگێڕێکی تاکڕەهەندی دۆگماییە، بێ ئەوەی توانیبێتی لە سەنگی ئینسانییەتی خۆی ئازاد بێت، بەڵام غەزەلنووس قارەمانێکی تاقانەیە لە ئەدەبی مندا، مردنی بۆ من وەک مردنی جوانی و خۆنەویستی و ئایدیالگەرایی بوو لە دونیادا... تەواوی تێکستەکە لای من وەک پرسیارێک بوو، بڵێم «جەناب، ئاغای غەزەلنووس، ئێوە چی دەکەن لەم دونیا پیسەدا؟ لە دوای چیین؟ زوڵم چۆن دەپێورێت؟ مێژووی ستەم و مردن و ناهەقی چۆن دەنووسرێتەوە؟»، بۆیە کوشتنی غەزەلنووس ساتێکی وجودی و شەخسی و ڕۆحی بوو. بەر لە هەر شت لە ڕێگەی مردنی غەزەلنووسەوە پرسیارم لە مانای بوونی خۆم کرد؟ غەزەلنووس دەزانێت دەکوژرێت و بە پێی خۆی دەڕوات، ئەوە تراژیدیای گەورەی مردنەکەیەتی... بەڵام گریان.. نا... گەر ڕاستگۆ بم هیچ کات لە کاتی نووسیندا نەگریاوم، هەندێجار پێدەکەنم، ئەویش کەم، بەڵام بۆ گریان نەگریاوم. جیا لەوەی هەر جارێک ڕۆمانی (دواهەمین هەناری دونیا) بخوێنمەوە، لە کۆتاییدا زۆر دەگریم.

***لە چاوپێکەوتێکی پشووتدا دەڵێیت: (گەر بمرم**




من دەڵێم قوربانی مەرج نییە بەڕەحمتر بێت لە جەللاد. لە رێگەی کوشتنی سامیرەوە ویستم بڵێم توندوتیژی بەردەوامە و قوربانی دەتوانێ شوێنی جەللاد بگرێتەوە. بەداخەوە ئەو پێشبینییە دواتر بە جۆرێکی زۆر زۆر ترسناک لە عیراقدا هاتە دی





**بەختیار عەلی ١٩٨٤، ئێران**

**و بهێڵن تەنها یەک کتێبی خۆم ببەم بۆ ئەو دونیا، لەناو هەموویاندا ڕۆمانی (دواهەمین هەناری دونیا) دەبەم.. ئێستاش دەڵێیت هەموو جارێک لە دوای خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە، دەگریم. تایبەتمەندیی ئەم ڕۆمانە چییە کە وا جیای دەکەیتەوە لە ڕۆمانەکانی ترت، بۆ ئەم ڕۆمانە؟**

-لە سەرەتای نووسینمەوە زۆر حەزم لە تێکستێک بووە کە دنیای منداڵ و گەنجانی بێدەرەتان و ئەوانەی لە خواری کۆمەڵگەوە دەژین، بنووسم. لە سەرەتاوە کە دەمنووسی دەمویست بڵێم «تەماشا بکەن، ئێمەی خەڵکانی مەحروم، بەدشانس، پەراوێزی، دامێننشین دەشێت چ ژیانێکی ماناداریشمان هەبێت». لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ دەمەوێت بڵێم سەیر بکەن ببینن خەڵکانی بنی کۆمەڵگە چ جوانن. هەست دەکەم بەشێکی گرنگی وەزیفەی ڕۆماننووسین ئەوە بێت ئاوڕ لە ژیانی ئەوانە بداتەوە. لەم ڕۆمانەدا تا ئەندازەیەکی زۆر ئاوڕم لە دنیای ئەوانە داوەتەوە. کەم لە تێکستەکانی تردا بەو شێوە ڕوونی و تراژیدییە باسم لە چارەنووسی ئەو نەوەیە کردووە کە لە سەردەمی بەعس و ڕۆژگاری شەڕی ناوخۆدا ژیان، ئەو نەوەیەی کە بەشێکی سەردەمی ژیانیان کەوتە ناو بەعس و بەشەکەی دی کەوتە ناو شەڕی ناوخۆوە. ئەو نەوەیە نەوەیەکی زۆر بریندارە، خۆشم لەو نەوەیەم، لە ناو جەرگەی ئازاری ئەو نەوەیەوە هاتوومەتە دەر، بڕێکی زۆر لە ئازار و برینەکانی خۆم لەو ڕۆمانەدا ئامادەیە، دەتوانم بڵێم شەخسیترین ڕۆمانی من (دواهەمین هەناری دونیا)یە... نا ناڵێم کاراکتەرەکان منن، بەڵام کۆی ڕۆمانەکە، بە هەموو ڕەهەندە واقعی و سەمبولی و خورافییەکانییەوە ئاماژەیە بۆ پاشەگەردانیی دەروونی خۆم. من هەمیشە نابینایەک کە بۆ بینایی دەگەڕێت لە ناخمدا بووە، باوکێک کە بۆ منداڵەکەی دەگەڕێت لە ناخمدا بووە، منداڵێک کە بۆ ڕابوردووی دەگەڕێت لە ناخمدا بووە، هەمیشەش بۆ ژێر درەختێک ڕوانیوومە لە بنیدا هەمووماں پەیمانێکی ئەبەدی مۆربکەین، دواجار دەشپرسم، من خۆم چیم جگە لە گەڕیدەیەکی نائومێد، کە لە دەریایەکی گەورە و بێکاراندا ونبووم و نازانم بۆ کوێ دەچم؟ هەموو ئەو شتانە وادەکەن (دواهەمین هەناری دونیا) لای من زۆر تایبەت بێت، وەک ژیاننامەی تایبەتی خۆم، بە جۆرێک لە بایۆگرافیای

# ئەو پەیوەندییە عاتفییەی لەگەڵ دواهەمین هەناردا هەمە، لەگەڵ رۆمانەکانی ترمدا نیمە



**بەختیار عەلی لە پاڵ پەیکەری کارڵ مارکس**

ڕەمزی سەیری بکەم.

***کاتێک نووسەرێک بەرهەمێکی یان تێکستێکی جیادەکاتەوە لەوانی تر، هەست ناکەیت بەوە زیان ئەدات لە کارەکانی تری خۆی، چونکە بە جۆرێک لە جۆرەکان خوێنەر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی بۆچوونی ئەو قسەیەی نووسەرەکەوە؟**

-من لەگەڵ (دواهەمین هەناری دونیا)دا پەیوەندییەکی عاتفیترم هەیە. ئەگەر وەکو خوینەرێکی بێلایەن بخوێنمەوە، رەنگە (کۆشکی باڵندەکان)م پێ خۆشتر بێت، رەنگە وەکو چیرۆک جوانتر بێت لە دواهەمین هەناری دونیا و زیاتر سیفاتی رۆمانی تێدا بێت. ئەو پەیوەندییە عاتفییەی من لەگەڵ دواهەمین هەناردا هەمە، لەگەڵ رۆمانەکانی تردا نیمە. تێکستەکانی من رەنگە ئاوێنەی فیکری خۆم بن، نزیک بن لە بۆچوونە عەقڵی و تێگەیشتنە فەلسەفییەکانمەوە بۆ ژیان. ئەوانی تر لە ئاستی سەنعەتی رۆماندا دەشێت لەو باڵاتر بن، لە ئاستی تەکنیک و دەوڵەمەندیدا غەزەلنووس لە کوێ و دواهەمین هەنار لە کوێ؟ هەڵبەت غەزەلنووس تێکستی کەسێکە ئەزموون و سەنعەتی ئیشەکە کەمێک باشتر فێربووە، بەڵام من قسەم لە پەیوەندییەکی عاتیفییە بە تێکستەکەوە. دواهەمین هەناری دونیا شکایەتی شەخسیی منە لە دونیا! ئەو تێکستەیە گەر لەگەڵ خۆمدا ببیەم بۆ ئەو دونیا، رەنگە لەوێ روونتر و باشتر لە حاڵی ئینسان لەسەر ئەم زەوییە تێبگەن.

***منیش پێم وایە (کۆشکی باڵندە غەمگینەکان) زیاتر تایبەتمەندیی رۆمانی تێدایە، وا ئەزانم (ئێوارەی پەروانە) هەنگاوێکی گەورەیە لەناو رۆمانی کوردیدا، هەمان کات لە نێوان کۆشکی باڵندە غەمگینەکان و رۆمانەکانی ترتدا هەنگاو و بازێکی گەورە دەبینم، کە نووسەر بە قورسی دەتوانێ ئەو هەنگاوە بنێ.. هەست ئەکەم ئەزموونی (کۆشکی باڵندەکان) قورستر بووبێت لەوانی تر بۆ تۆی نووسەر.. نازانم ئەو هەستەم لەجێی خۆیەتی یان نا؟ ئەگەر بشێ ئەو پرسیارە بکەین، بۆ کاری لەمەودوا دەتەوێ بە کام جۆریان بنووسی؟**

-بێگومان ئەزموونێکی قورس بوو. لە کۆشکدا هەم شێوازی گێڕانەوە، هەم شێوازی مامەڵەکردنم لەگەڵ کاراکتەردا تا ئەندازەیەک بەراورد بە رۆمانی



دواهەمین هەناری دونیا شکایەتی شەخسیی منە لە دونیا! ئەو تێکستەیە گەر لەگەڵ خۆمدا ببیەم بۆ ئەو دونیا، رەنگە لەوێ روونتر و باشتر لە حاڵی ئینسان لەسەر ئەم زەوییە تێبگەن



دواهەمین هەنار جیاوازە. لە کۆشکدا کامڵبوونی زیاتر هەیە، وێناکردنی کاراکتەر باشترە، بەڵام ئایا قودرەتی ئەوەم هەیە باشتربم؟ نازانم. بە وردی نازانم بەیانی چی دەنووسم، بۆ نووسەریش تەنیا و تەنیا ئەوە گرنگە کە بەیانی دەینووسێت. ئەو شتانەی نووسراون و جێمهێشتوون، ئەو بایەخە گرنگەیان لای من نەماوە، ڕاستییەکەی پتر خوێنەران ئەو تێکستانەم بیردەخەنەوە. بۆ نووسەر هەمیشە ئەوە گرنگە کە بەیانی دەینووسێت.

بۆ من زەحمەتە بتوانم جارێکی تر تێکستێکی وەکو (دواهەمین هەناری دونیا) بەو شێوە عاتفییە بنووسمەوە، لە قەسیدەکانیشمدا ڕەنگە بتوانم قەسیدەیەکی تری وەک دەرگاکان بنووسمەوە، بەڵام زەحمەتە بتوانم (نیشتمان) بنووسمەوە، چونکە پەیوەندیی بە جۆرێک هەڵچوونی عاتفتی و ئینسانی و شەخسییەوە هەیە، کە تەنیا لە ساتێکی تایبەتیدا تێیدا دەژیت. ئەو شتانەی پەیوەندییان بە سەنعەتی ئەدەب و هونەرەوە هەیە، ڕەنگە بتوانین دووبارەیان بکەینەوە، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە پێکهاتی عاتفیمانەوە هەیە، دووبارەکردنەوەیان زۆر سەختە. قەسیدەی (نیشتمان) بۆ من کە گەنجێکم لە وڵاتێکی پڕ ناشیرینیدا، بریندار، پەراوێزخراو، ساتێکی تایبەتی و شەخسیی منە، بۆیە زەحمەتە لە پەنجا ساڵیدا ئەو ئەزموونە دووبارە بکەمەوە. ڕەنگە بۆ من عەقڵانی تر و باشتر بێت بە شێوازی (کۆشکی باڵندە غەمگینەکان) بنووسم، دوای ئەزموونێک نەکەوم کە ناتوانم دووبارەی بکەمەوە، بەڵام ئەو شتانە بڕیار نین، پیریش دۆخی دەروونی و عاتیفیی خۆی هەیە. زۆر لە نووسەران لەزەتێکی زۆریان لەوە بینیوە وەک پیر بنووسن، ئاخۆ من دەتوانم ئەوە بکەم؟ بە هەرحاڵ گرنگ ئەوەیە وەک زۆر کەس لە مردن و پیری ناترسم، بۆیە دوور نییە بتوانم ساتە عاتیفییەکانی بگوازمەوە. بە گشتی من لە منداڵی و گەنجیمەوە پێشتر پیربوونی ڕۆحیم تاقیکردووەتەوە، ڕەنگە ئەوە هۆکارێکی باش بێت بمکرێت فەزا تاریک و تەڵغەکانی بگوازمەوە...

**تێبینی:**

**هەندێک لە فۆتۆکانی ئەم دۆسیەیە بە کامێرای «خەسرەو حەمەکەریم» گیراون.**

